# مێرگ

MERIG

گۆڤارێکی رۆشنبیریی گشتییە

ژمارە(٤) سالی یەکەم ٢٠٠٥




## دیاربەکر

## مۆزەخانەی مێژوو و دەروازەی رۆژهەڵات و رۆژاوایە

## دنیای مەقام و مەقامبێژان لە کەرکووک و گەرمەسێری گەرمیاندا

## لیبرالیەتی نوێ و پرنسیپەکانی

# مێرگ

MERIG

گۆڤارێکی مانگانەی ڕۆشنبیریی گشتییە ژمارە(٤) ساڵی یەکەم ٢٠٠٥




نامەد یا دیاربەکر لەکۆنەوە شارێکی قایمی بەشووورەو بورج و باروو بووە و سەرحەدی نێوان ڕۆمان و فارسە کۆنەکان بووە، لەدواییشدا بۆتە شارێکی گرنگی سەر سنووری نێوان دەوڵەتی ئیسلام و ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانی. ل١٠



وەکو دیارە هەر گوندێک لە ناوچەکانی ئێمەدا چەندین کانی لێیە، چ لەناو گوندی بێت چ لەناو زەویەکانی، کانی هەر گوندێکیش یان هەر ناوچەیەک لە(سووکی، ساردی، شیرینی، گەرمی،گرانی) وەک یەک نین، ئەوەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە چەند جۆرە کانییەک هەیە. ل٧٠



مرۆڤ هەر لە سەرەتاوە هەوڵی داوە خۆی جلپۆش بکات، بەرادەیەک پۆشاک بۆتە ناسنامە، ناسنامەیەکی جوان و ڕەنگین. جلوبەرگی کوردیش بەو ئەندازەو جوانیەی خۆی سەرنجی هونەرمەندان و ڕۆژهەلاتناسانی ڕاکێشاوە.

لێرە بۆ پێدانی زانیاری لە بارەی پۆشاکی خۆماڵییەوە، ئەم ڕیپۆرتاژەمان بۆ خوێنەرانی بەڕێز ئامادەکرد. ل١١٨


**خاوەن ئیمتیاز**
سەرکیس ئاغاجان

**سەرنووسەر**
فەلەکەدین کاکەیی

**بەڕێوەبەری نووسین**
محەمەد خۆشناو

**ب- پەیوەندییەکان**
عەباس عەبدوڵلا یووسف

**بەڕێوەبەری هونەری**
عوسمان پیرداود

**دەستەی نووسەران**
کەریم شارەزا
کەریم سۆفی
محەمەد تەها حوسێن
تاهیر عوسمان
ئەحمەد حەیران

**پەیامنێران- فۆتۆکاران**
سەلام عەدۆ
هێمن حەمید
شڤان توفیق
کارزان نەجمەدین
وشیار ئەحمەد ئەسوەد

**سەرپەرشتیاری هونەری**
قەرەنی جەمیل



**ناونیشان:**
شەقامی ٦٠م نزیک وەزارەتی داد

**ژمارەی تەلەفۆن:**
هەولێر ٢٥٠٩٥٠٧
کەرکوک ٠٧٧٠١٣٣٤٩٥٨
سلێمانی ٠٧٣٠١١٧٨٥٨٣
٠٧٧٠١٤١٣٦٨٤
دهۆک ٠٧٥٠٤٥٧٤٥٤٩

E.mail:
govari_merg@yahoo.com

E.mail:
govari_merg@hotmail.com

# مێرگ

ژماره (٤)
سالی یەکەم
ئەیلوول ٢٠٠٥





ل٢٢



ل٢٦



ل٤٢



ل٤٤



ل٧٣

# ناوەڕۆکی ئەم ژمارەیە





ل١٣١



ل١٣٤



ل١٤٠



ل١٤٤



ل١٥٠

# دوای (سیڤەر) پەیمانی بەغدای ٢٠٠٥

فەلەکەدین کاکەیی

ڕەشنووسی دەستووری هەمیشەیی عێراق بە "پەیمانی بەغدا" ناو دەبەم.

لە مێژووی پەنجاکانی سەدەی بیستەمدا پەیمانێکی نێودەوڵەتی مۆرکرابوو بە ناوی "پەیمانی بەغدا" لە نێوانی عێراق و تورکیا و ئێران و پاکستان، بە بەشداربوون و سەرپەرشتی ئینگلیز، پەیمانەکە دژی مەسەلەی کورد و بزووتنەوەی ڕزگاری خوازەکەی و دژی جووڵانەوەی ئازادیخوازی گەلانی ناوچەکەبوو، ئەو پەیمانە، بە ڕووخانی ڕژێمی پاشایەتی عێراق لە ساڵی ١٩٥٨دا، تێکچوو و پەیمانێکی دیکەی لێ بووەوە بەناوی (سەنتۆ)... ئەویش دواتر بە ڕووخانی پاشایەتی ئێران، تیا چوو.

پەیمانی بەغدای ئەمجاکە ڕەشنووسەکەی مانگی ڕابردووە، زۆر جیاوازە و تێدا کورد بەردی بناغەیە. ئەم جارەیان چەرخی گەردوون، بۆ بەختی کورد، گەڕاوەتەوە بەغدا، لە ماوەی چەند هەفتەی ڕابردوودا، مەیدانی تێکۆشانێکی مێژوویی گەورەی سیاسی و فیکری و یاسایی گەلی کوردستان بوو، کە هەوڵی دەدا بوونی خۆی و مافی قەوارەی نەتەوەیی بسەلمێنێ.

ئەو بەغدایەی کە هەمیشە مەڵبەندی بڕیار و یاسای چەوسانەوەی بەسەر خەڵکی کوردستان بوو، لە مانگی ئابی ڕابردوودا بوو بە سەنگەری بەرگری لە کوردستان.

ئەو ڕەشنووسەی بە ئەنجام گەیشت ڕەوابوونی مەسەلەی کورد و دیموکراسی و فرەلایەنی و فیدرالیزم دەگەیەنێت.

لەمە بەدواوە چ دەنگ بە ڕەشنووسی دەستوورەکە بدرێت یان نەدرێت، ئیتر ئەوە ڕاستییە چەسپا کە عێراق لە سێ دۆخ، سێ حاڵەت، سێ کەش و هەوای سیاسی و کەلتووری ئاوات و ئامانج، سێ بیرورا، تەنانەت سێ مێژوو و سێ جوگرافیا، پێک هاتووە.

یەکبوونەوەی ئەم سێ حاڵەتە زۆر زەحمەتە ئەگەر مەحاڵ نەبێ، مەگەر تەنیا و تەنیا لە ڕێگەی سیستەمێکی فیدراڵی یان کونفیدراڵی، لەسەر بناغەی یەکگرتنی ئارەزوومەندانەوە بێت.

لە پرۆسە سیاسییەکەی مانگی ئابدا، ئەو لایەنەم، لە لایەنەکانی دیکە گرنگترە، واتە: گریمان لە ریفراندۆمدا دەنگ بە ڕەشنووسەکە نەدراو جارێکی دیکە پرۆسەی دانانی ڕەشنووسی دەستوور دەستی پێکردەوە، ئەوە بۆ ئێمەی کورد و زۆربەی

خەڵکی عێراق ڕێگە نادەین، لە ناوەڕۆکدا، بەرەو پاشەوە بچین، بەڵکو دەبێ هەنگاوی بەرزتر بنێین.

ئەگەر خاڵ بە خاڵی هەڵبسەنگێنین، ڕەنگە ئەم ڕەشنووسە نەگاتە پایە و گرنگی پەیمانی (سیڤەر)ی بەر لە پتر لە هەشتا ساڵ، بەڵام لە ڕووی مەعنەوی و هێما و مانای ئەو فیدرالیزمەی باسی لێوە دەکات، خۆی لە پەیمانی (سیڤەر) نزیک دەخاتەوە.

ئەگەر بە تەرازووی هەق و داد بیکێشین، ئەوە ڕەشنووسی دەستوورەکەی بەغدا ناگاتە ئاستی قوربانیدان و خەباتی گەلی کوردستان و کەمترە لەو مافەی کە شایانیەتی.

لێ، ناشبێ ئەوەندەی لێ کەم بکەینەوە کە بە هیچی بزانین، لەوەتی ڕەشنووسەکە ڕاگەیەندراوە سێ جۆر هەڵسەنگاندن دەبیستین:

١- هەڵسەنگاندنی واقیعبینانە، وەکو هەیە، بە چاکی و دروستی و لایەنە لاوازیەکانیەوە کە زۆر کەم کەس توانیویانە، بەم جۆرە واقیعبین بن.

٢- هەندێ کەس ئەوەندە بە شان و باڵیا هەڵدەدەن، وەکو بڵێی لەمە چاکتر و زیاتر نابێ و کورد هەموو شتێکی بەدەست هێناوە ئەم بۆ چوونە زیادەڕەوییە و دروست نییە.

٣- هەندێ کەسیش ئەوەندەی بچووک دەکەنەوە و، بەکەمی دەزانن، تەنانەت وەکو ئۆتونۆمییەکەی سەدام یا لە ئەو کەمتریش دەبینن، ئەم بۆ چوونەش دروست نییە.

ڕەشنووسەکە لە واقیعدا نە زۆر باش باشە، نەکەم و خراپیشە.

لە لایەکەوە شایانی ئەم هەموو فیداکاری و قوربانیدانە نییە، بەڵام ئەوەندەش کەم و نزم نییە کە بە هیچی بزانین.

ناوەڕۆکی ڕەشنووسی دەستوورەکە بۆ مەسەلەی کورد بێگومان لە ڕێککەوتننامەی ١١ ئاداری ١٩٧٠، زۆر پێشکەوتووترە.

ڕەشنووسەکە، هەروەها، لە یاسای بەڕێوەبردنی دەوڵەتی عێراق(تاڵ)ی ساڵی ٢٠٠٤ پێشکەوتووترە.

لە چەندین ڕووەوە دەسکەوتی باڵاتر هاتووەتە دەست، بە تایبەتی لە دابەشکردنی سامان و داهات و موڵکیەتی خەڵکی کوردستان.

- کێشەی کەرکووک و ناوچە دابڕاوەکانی دیکەی کوردستان، ئەمجارە، بەشێوەیەکی ڕوونتر یەکلاکرایەوە، دەتوانم بڵێم کە خستنی کەرکووک و ئەو ناوچانە بۆ سەر هەرێمی کوردستان خەریکە مسۆگەر دەبێ. لە ڕاپۆرتی تیمێکی (ئاسایشی نەتەوەیی ئەمەریکی)دا پێشنیار دەکەن کەرکووک بخرێتە سەر هەرێمی کوردستان، باشترە. لە ڕاپۆرتێکی دیکەی کۆمیتەیەکی کۆنگرێسی ئەمەریکادا دوورتر ڕۆیشتوونەو باس لە زەروورەتی دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستان دەکەن کە ئاشتی و ئاسایشی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست مسۆگەر دەکات.

- سنووری هەرێمی کوردستان بەپێی نەخشەی هەرێم دوای چارەسەری کێشەی کەرکووک و قەزاو ناحیە کوردنشینەکانی دیکەی دیاری دەکرێت، کە ڕەنگە نزیک بێت لەو نەخشەی کە خراوەتە بەردەست.

- ناساندنی زمانی کوردی، بەفەرمی شانبەشانی زمانی عەرەبی، پێشکەوتنێکی دیکەی بەرچاوە کە تایبەتمەندێتی کەلتوور و ڕەگەزو قەوارەی کوردستان دەسەلمێنێ.

- بەپێی ئەو دەستوورە هەرێمی کوردستان خاوەنی دەزگاو هێزی ئاسایش و

پێشمەرگەیە(پاسەوانی هەرێم).

- مانەوە و یەکگرتنی هەرێم لە چوارچێوەی عێراقدا، ئارەزوومەندانەیەو تا ئەو کاتەیە کە رێز لە دەستوورەکە بگیرێت.

ئەگەر دەستوورەکە پێشێل کرا، ئەوە عێراق بە یەکگرتوویی نامێنێ.

- ئەوە و چەندین خاڵی ئیجابی گەورەی تێدایە کەواتە دەستوورەکە بەگشتی لە بەرژەوەندی مەسەلەی کوردستاندایە.

رەوا نییە ئیجگار بە کەمی بزانین و بەنزم بینرخێنین.

لە وەڵامی رەشبینانێدا دەڵێین: بڕێک واقعبین بن و لایەنە ئیجابییە بەرزەکانی رەشنووسی دەستوورەکە ببینن.

بەوانەش کە لە زیادە بەدەر گەشبینن دەڵێین: وەهاش نییە. ئەم دەستووورە ئەگەریش پیادەکرا هەموو ئاواتەکانی گەلی کوردستان ناهێنێتە دی، بەڵام ئەوەندەش لایەنی ئیجابی و گەشی تێدایە کە شایەنی پشتیوانییەو هەقە تێکڕای خەڵکی کوردستان دەنگی پێ بدەن.

وەفدی کوردستان بە سەرۆکایەتی بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان بۆ بەغداو نوێنەرانی کوردستان لەوێ، وزەو توانای خۆیان بەکار هێنا تا ئەو دەسکەوتانە بەدەست بهێنن کە جێگەی رێزو رەزامەندییە.

لە ئێستا بەدواوە دەبێ، بەلایەنی کەم، ئەمانە ئەنجام بدەین:

١- هەوڵ بدەین گشت یا زۆربەی هەرە زۆری خەڵکی کوردستان لە ریفراندۆمیدەستووردا دەنگی رەزامەندی بدەن(ئەرێ).

٢- لەگەڵ لایەنەکانی دیکەی عێراق و ئەمەریکا و ئینگلیز هەوڵ بدەین تا زۆربەی خەڵکی عێراق بە دەستوورەکە بڵێن (ئەرێ)

٣- ئاسایش و ئارامی بپارێزین.

٤- کاروباری ناوخۆی هەرێم رێک بخەینەوە. دوای یەکگرتنەوەی حکومەتی هەرێم بکەوینە چاکسازی و خزمەتی فراوانی هاووڵاتییان و چاککردنی باری گوزەرانی ژیان و تەندروستی و پەروەردەو ئاوەدانی فراوانتر و گەشە پێدانی هەمە لایەنەو رەچاوکردنی دادپەروەری لە دابەشکردنی داهات و خزمەتگوزاری.

٥- پەیوەندی بە ناوچەکانی دیکەی عێراق و لایەنەکانەوەباشتر بکەین لەسەر بنەمای لێکحاڵیبوون و رێزلێنان و دانان بە مافی یەکتریدا. لەم بوارەدا دامودەزگاو نوێنەرانی کوردستان سوورن لەسەر عێراقێکی دیموکراتی فیدرالی و پاراستنی یەکێتی عێراق لەسەر بنەماکانی ئەو دەستوورە.

٦- پەیوەندی لەگەڵ حکومەت و میللەتی تورکیا چاکتر بکەینەوە و دۆستایەتی نێوان کوردو تورکمان پتەوتر بکەین. بەرژەوەندی و ئاواتی هاوبەشی هەرێم و تورکیا زۆرن، دەبێ هەوڵ بدەین تا حکومەتی تورکیاش لەو راستییە بگات هەروەها پەیوەندی هەرێم و دراوسێکانی تریش بەرەو باشتر ببەین. لەمە بەدواوە ئیتر وەختی ئەوە هاتووە بە ئارامی دابنیشین و لە ئایندەی دوور بیر بکەینەوە و نەخشەو پلانی گەشە پێدان و پێشکەوتن دابڕێژین، چونکە ئەم دەستووورە ئەگەر پیادەبکرێت بۆ دەیان ساڵی تر ئاشتی و مافی کوردی مسۆگەر کردووە.

■

# کۆمەڵگەی مەدەنی یان یۆتوبیا؟!

محەمەد خۆشناو

کۆمەڵگەی کوردستان لەم چەند ساڵانەی رابردوودا... ئەگەر هەندێ لایەنی قێزەونی وەکو شەڕ و کێشە وململانێی نەخواستراوی لێدەربکەین... قۆناغێکی گرنگی بڕیوە کە دەتوانین بڵێین لە مێژووی ئێمەدا قۆناغ و رەوشی وامان نەدیوە.. لە تەک هەڵمەتی پرۆسەی ئاوەدانکردنەوە و بیناسازی و ئارامی و بووژاندنەوەی بازاڕ و نوێکردنەوەی شوێنە کۆنەکان و دەیان کاری گەورەی خزمەتگوزاری کە وێڕای هەندێ کەموکوڕی و بێ چاودێری... قۆناغێکی زێڕین بوو بۆمان... لە پاڵ ئەم هەڵمەتە بزووتنەوەیەکی نوێگەرایی هەندێ لە بوارەکانی گرتەوە... نوێگەرایی رۆژئاوا بە حوکمی پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیا و گەیاندن بۆتە رۆشنبیریەکی جیهانی و خۆی ئاخنیوەتە ناو هەموو کون و کەلەبەرێکی ئەم جیهانە کە کۆمەڵگەی کوردستانیشی گرتۆتەوە و ئێمەش توانیومانە راستەوخۆ یا ناراستەوخۆ سوودی لێ وەربگرین... جا بەلاسایی کردنەوە بێ یا بەکاربردن بە شێوەیەکی میکانیکیانە، بێ ئەوەی تێی بگەین کە چیە... ئێمە سوودمان لە ئەنتەرنێت وەرگرتووە، بێ ئەوەی بزانین جیهانی ئەنتەنێت چیە... یا سوودەکە بەرەو ئاقارێک دەبەین بۆ مەبەستی تاکەکەسی بەکاری دەهێنین کە شوورەییە هی ئەوە بین، ئێمە ئەم دەزگا پێشکەوتووە لە خزمەتی بەرژەوەندی تەسکی خۆماندا بەکاری بێنین... و بە پێی پێوەر و ئاستی هزر و هەستی خۆمان مامڵەی لەگەڵدا دەکەین...

باسی کۆمەڵگەی مەدەنی دەکەین... بێ ئەوەی بزانین ئێمە کێین و چۆن دەتوانین چەمکی کۆمەڵگەی مەدەنی لەگەڵ پەیوەندیە کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری و ئابووریەکانی بێتەوە... ئێمەین کە تا ئێستا هەر لەژێر دەسەڵاتی باتریارکی و سیاسی و دەسەڵاتداین و سەربەخۆ نین و نەمانتوانیوە لێی دەرباز بین... مەبەستمان وەکو بزووتنەوەی ئازاد لە دەرەوەی چوارچێوەی دەسەڵاتی راستەوخۆی سیاسی...

هەرجارێ بە مۆدەیەکەوە دەگرین... پێشتر لە حەفتا و هەشتاکاندا بە چەمکە مارکسیەکانەوە گرتبوومان... باسی ئۆرۆشیوعیەتمان دەکرد و دەمانویست وتەکانی هربەرت مارکوز و ئەلتۆسێر و لۆکاش و دوبرێ و فرانز فانۆن- بێتە نێو خۆمانەوە و

دەمانگوت دەبێ ئەم تەوژمەش لە نێو بەهاکان و بزاڤەکەماندا هەبێ. لە نێو کوڕ و کۆبوونەوەکاندا بە جۆش و خرۆشەوە باسی ململانێی نێوان بۆرژوازیەت و پرۆلیتاریامان دەکرد، بێ ئەوەی دەرک بەوە بکەین کە ئەم دوو چینە بە مانا زانستی و بابەتیەکەی هەر وجوودیان نەبووە لە نێو کۆمەڵگای کوردستاندا...

ئێستاش لێرە، لەوێ و لەسەر رووپەڕی رۆژنامە و گۆڤارەکاندا باس باسی نوێگەرایەتی و لە دوای نوێگەرایەتی مەبەستم (پۆستمودێرنیزم)ە، ئەم چەمکە خواستراوانە کە ئێستا هەندێ نووسەر بە ئێمەی دەفرۆشنەوە و خۆیان پێ هەڵدەکێشن وەک ئەوەی ئەوان لە لوتکەی ئۆرۆستوکراتیەتی رۆشنبیری کوردیدا بن و ئەوانی خوارەوەش مێگەل، بە جۆرێک فەیلەسووفی تەفکیکی جاک دریدا بۆتە ئەستێرەیەکی پرشنگداری ئاسمانی (رەخنەی ئەدەبی- هەڵوەشاندن- ی کوردی!!)...مەبەستم ئێمە (بەرهەمەکانی) نوێگەرایەتیمان وەرگرتووە، بەڵام نەمانتوانیوە (فەلسەفە)ی نوێگەرایەتی هەزم بکەین و بەباشی پیادەی بکەین... بە ناوی کۆمەڵگەی مەدەنی و نوێگەرایی سەرکۆنەی هۆز و خانەوادە و خێزان دەکەین، بەڵام تەنها سەرکۆنەکردن و داوای گۆڕان نەفی بوونی کردەیی و کاریگەری ئەم دەزگایانە ناکات، ... کاتێ ئێمە باسی چەمکی کۆمەڵگەی مەدەنی دەکەین دەبێ بەر لە دەرهاویشتە و بەرهەمی کۆمەڵگەکەمان لە ئەزموونی کۆمەڵایەتی و مێژوویی خۆیدا، پێکهاتەی کۆمەڵگەی مەدەنی خۆمان بزانین واتە گۆڕانکە لە ناوەرۆکدا دەست پێ بکەین، نەک لە فۆرم و روخسار، تۆ کە دێیت هەوڵی دروستکردنی کۆمەڵگەی مەدەنی دەدەی نەک بە مانای چەمکە خواستراوەکەی... دەبێ بزانی کە کۆمەڵگەی ئێمە لە نێو خەمی رۆژانە... خەمی مرۆڤی کوردستانی کە هەرگیز هەست ناکەی ئەو مرۆڤە بیرکردنەوەی لە رۆژێک زیاتر تێپەڕێ... خەم و ئەشکەنجە و ئازاری مرۆڤی کورد و خاکی کوردستان ئەوەندە بە ژان و قورس بووە، نەیهێشتووە هزرێکی ستراتیژی و درێژخایەنی هەبێ... هەمیشە لەنێو ترس و دڵەڕاوکێ و سڕینەوە و لە ناو بردندا بووە... ناتوانین بە شەو و رۆژێک بە (کن فیکون)ێک هەموو شتی بەسەردا بسەپێنین... لەمە چەند ساڵی رابردوو دەیان بەناو رێکخراوی ناحکومی لە هەرێمی کوردستان دروست کران کە بانگەشەی پێکهێنانی کۆمەڵگەی مەدەنی دەکەن و دەیان چەمک و زاراوەی تازە بابەتی کۆمەڵگەی مەدەنیمان پێ دەفرۆشنەوە... بەڵام هەستمان نەکردووە کە ئەوان هەنگاوێکی وایان نابێ بۆ جێبەجێ کردنی ئەو پرنسیبانەی کۆمەڵگەی مەدەنی لەگەڵ بەها و داب و نەریت و پەیوەندییە کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری و ... هتد بێتەوە... هەر ئەوە نا، بەڵکو هەندێکیان کردوویانەتە سەرچاوەیەک بۆ بژێوی و خۆ هەڵکێشان و نان و پیاز پێوە خواردن.

ئەگەر سەیری دیمەنی کۆمەڵگەی کوردستان و بەراوردێک بکەین لەگەڵ رۆژانی بەر لە چەند ساڵێک هەست دەکەین ئەم کۆمەڵگەیەمان راستە زۆری ماوە بگاتە ئاستی ئومێد، بەڵام لە وەڵامی پرسیاری: ئایا ئەم کۆمەڵگەیەمان پێشوازی لە نوێگەرایی دەکات یان ناکات؟!

گومان لەوەدا نیە، بەڵێ... ئامادەیە.

* مەرد لە بوون و لە نەبوونیا وەک یەک وایە، بەڵام نامەرد تا نییەتی وەک سەگ ئەوەڕێ، کە بووشی وەک کەر ئەزەڕێ.

**شێخ محەمەدی خاڵ**

* لەدوا جەنگی جیهانیدا، هێزەکانی هاوپەیمانان بەچەک دژی ئەڵمانیا دەجەنگان و بە ڕۆژنامەش دژ بە دونیا.

**جۆرج سەکاف**
**سیاسەتمەدارێکی لوبنانی**

* دەبێ چاوەکانمان رابێنین بۆ ئەوەی شت لە سبەیدا ببینێت، نەک تەنیا لە ئێستا دا، هەروەها بزانی چۆن لەناو دێرەکانی ئێستا، ئاینده بخوێنێتەوە.

**تەوفیق ئەلحەکیم**

* کە ئاژەڵ نەخۆش دەبێ، دەخزێتە نێو کونەکەیەوە، مرۆڤیش کە ئاژەڵێکی فەلسەفەبێژە، ئەویش وادەکات.

**نیتشە**

* مێژوو گوێ ناداتە خۆزگەکانمان.

**ئۆزڤاڵد شپینگلەر**

* ئەگەر راگرایەتیم بۆ کۆلێژی کشتوکاڵ ٩ ساڵی خایاند، ئەوا ژنەکەم زیاتر لە ٣٥ ساڵە راگری ژیانمە.

**د. ئەحمەد موستەجیر**
**زانا و مامۆستای زانکۆ**

* هەر کەسێ جارێ رێ بەخۆ بدات درۆیەک بکات، دەبینێ زۆر ئاسانە درۆی دووەم و سێیەمیش بکات، درۆ لێی دەبێتە خوو.

**تۆماس جیفەرسۆن**

* تەکنیک، کەس بە پیرۆز دانانێت و رێزیش لە هیچ شت ناگرێت.

**ژاک ئەلیل**

* ئەگەر فیمینیزم ئاییندەی نەبێ، ئەوا تێکڕای جیهان بێ ئایندە دەبێت.

**دۆریس ئارون**

* خۆم خاوەن و خۆم هەڵسووڕێن و خۆم سەرپەرشتیکار، دەزگایەکی هەرە مەزنم بنیاد ناوە، بەڵام خۆم هەرە مەزن نیم، زانست هەرە مەزنە، کار هەرە مەزنە.

**بیل گێتس**
**خاوەنی مایکرۆسۆفت**

* ئێمە لە کەلتورێک دا دەژین، پێشوەختە گشت وەڵامەکان دەزانێت.

**ئەدۆنیس(شاعیر و بیریار)**

* هەتاو... زێڕی هەژارانە.

**ناتالی کلیفۆرد بارنی**

ئامەد یا دیاربەکر لەکۆنەوە شارێکی قایمی بەشووورەو بورج و باروو بووە و سەرحەدی نێوان رۆمان و فارسە کۆنەکان بووە، لەدواییشدا بۆتە شارێکی گرنگی سەر سنووری نێوان دەوڵەتی ئیسلام و ئیمپراتۆرییەتی رۆمانی. لە سەردەمێکی زووەوە چەندەها جار دوژمنانی هێرشیان کردۆتە سەر و هەزاران کەسیان لە رۆڵەکانی لەناو بردووە و گەلێکیشیان لێ دەربەدەر و ئاوارە کردوون، کەچی جەنگاوەرە ئازاکانی بەرگرییان لەشارو ناوچەکەیان کردووە و فیداکارییەکی زۆریان نواندووە.







له چاخەکانی پێشووی مێژوودا ئەم شارە گەورەیەی کوردستانی باکوور، مەڵبەندی رووناکبیری و شارستانیەت و بازرگانی بووە و کەوتووەتە باشووری رۆژئاوای دەریاچەی (وان).

لەبارەی ناوەکەی (ئامەد)ەوە کە لە چییەوە هاتووە؟ بەپێی راو بۆچوونی هەندێ لە مێژوونووسان ئەم ناوە لە وشەی (ئامادە)ەوە هاتووە، واتە:ئامادە بۆشەڕو بەرەنگار بوونەوەی دوژمن. چونکە شوورەیەکی گەورەو قایم دەوری دابوو و ئەو هێزەی ناوی بۆ پارێزگاریی شارەکە لەدەستدرێژی دوژمن هەمیشە ئامادە بوون بۆ بەرگری کردنی شارەکە لە هێرشی دوژمنی داگیرکەر.

ئاشوورییەکان لەسەردەمی خۆیاندا پێیان دەگوت(ئامادا)واتە: ئامادەیە بۆ جەنگ و کوشتار، بەڵام مێژوونووس سپایزەر دەڵێ:جاران بە میدیەکانیان دەگوت (مید، ئامادا، مادا)و ناوی (ئامەد)یش هەر

لەوەوە هاتووە.

لەدوای هاتنی ئیسلام ئەو ناوچەیەو شارەکە ناونرا (دیاربەکر)بە ناوی (بەکری کوڕی وائیل)کە داگیری کرد هەروەک (یاقووتی حەمەوی)دەڵێ و مانای(دیار بەکریش)وڵات یا ناوچەی بەکر دەگەیەنێ و ئەو ناوەش نەک هەر بەشارەکە، بەڵکو بە ناوچەکەیشی گوتراوە.

بەڵام کە دەستەڵاتی عەرەبە موسوڵمانەکان بێ هێز بوو و میرنشینیە کوردییەکان دروستبوون، ناوی دیار بەکر هەر بۆ شارەکە بەکار هاتووە.

### جوگرافیای شارو ناوچەکەی

میجەرسۆن گوتوویەتی: ئەو دەشت و زنجیرە چیایەی کەوتۆتە باکووری (ڕەها) لە بەرەبەیانی مێژووەوە مرۆڤیان لێ نیشتەجێ بووە و نەتەوەی کورد لەسەرەتای مێژووی سەردەمی ئارییەوە لەو ناوچەیەی (ئامەد)نیشتەجێ بووە.



جوگرافیاناس ئیسترابۆن لەو باوەڕە دایە، کە وشەی (کوردوا)ماوەیەکی زۆر بەو چیایانەیان دەگوت کە کەوتوونەتە نێوان مووش و دیاربەکر و ئەمەی دواییش واتە(ئامەد)دەکەوێتە ناوەڕاستی دەشتی فراوان، کە خاکێکی ڕەش و بەردی گڕکانی هەیە.

### ئاوو هەوای ئامەد

ناوچەی ئامەد کەوتۆتە بەرکاریگەریی ئاووهەوای ناوچەکانی دەریای سپی





ناوەڕاست. زستانی گەلێک ساردە و بەفرێکی زۆری لێ دەبارێ و زۆر جاریش بای ساردی لە باکووری ڕۆژهەڵات، لەناوچەکانی سیبریاوە بۆی دێت و دەبێتە مایەی دابەزینی پلەی گەرما بۆ چەندان پلە لە ژێر سفرەوە. بۆ نموونە لەساڵانی ١٩١٠و١٩١١دا ئاوی ڕووباری دیجلە کە شارەکەی کەوتۆتە سەر بەجۆرێکی وا بەستبووی کاروانی وڵاخ بەسەریدا دەڕۆیشت. بەڵام ئاوو هەوای شارو ناوچەکەی لە هاوینان گەرم و وشکە.

## باری مێژووی کۆن

وەک گوتمان میللەتی کورد لەبەرە بەیانی مێژووەوە لەم ناچەیەی (ئامەد)دا نیشتەجێ بووە. ماوەیەکی زۆر بەسەربەخۆیی لەو مەڵبەندەدا ژیاوە، تاکو داگیرکاریی ئاشووری کە لە ڕێگەی شاخاوییەکانەوە هاتن و دەستیان بەسەر وڵاتی سوبارتۆ و







کـوردوئین داگـرت و هەندێ سـەرچاوەی مێژوویی دەڵێن(نارام سین)ی شای ئەکەد لە سالآنی ۲۲۹۱-۲۲۵۵ی پ.ز هەڵمەتی بردۆتە سەر ئەو هەرێمانەی باکوور و لە شوێنەوارە کۆنەکاندا ئاماژە بۆ ئەوە کراوە.

(تیجلات پلێسەر)ی شای ئاشووری لە سـالّی ۱۱۰۰ی پ.ز ئەم ناوچەیەی سەرچاوەی دیجلەی گرتووە و (زەینەفۆن)ی مێژوونووسی یۆنانیش دەڵێ: کوردەکان توانیویانە سوپای فارس لەو ناوچانەدا تێک بشکێنن و سەربەخۆیی خۆیان بپارێزن.

## قەڵای ئامەد و بەرگری کردن لە شالآوی دوژمنان

ئامەد گەورەترین و قایمترین قەڵای مێژوویی بووە کە لەسەردەمێکی زۆر کۆنەوە رۆمانەکان دروستیان کردووە. لەپاش هاتنی ئیسلام لەسەردەمی خەلیفە عومەر کوڕی خەتاب، ئامەد و ناوچەکەی داگیرکران و لە



سەردەمی عەبباسیەکاندا ئەبوو جەعفەری مەنسوور کرا بە والی جزیرە کە ئامەد شارێکی گەورەیەتی و لە سەردەمی خەلیفایەتی (مەهدی)ش دا هارونە رەشید کرا بە والی ئەو هەرێمە، بازی کوڕی دۆستەکیش حکومەتی دۆستەکی مەروانی لە دیار بەکر(ئامەد)لە سالّی ٣٥٠ی کۆچی دامەزراند. لەسەدەی شازدەمەدا سەفەوییەکانی ئێران بە سەرکردایەتی شا ئیسماعیلی سەفەوی دیاربەکریان



گرت.بەڵام دوای شکانی شا لەشەڕی چالدیران لە ١٥١٤دا خەڵکی ئەو شارە گرنگەی کوردستان لەدژی ئەو سەفەوییانە راپەڕین و شارو ناچەکەی خۆیان بەیارمەتی عوسمانیەکان ئازاد کرد هەرچەندە دەوڵەتی عوسمانی دەیگوت دەست لە کاروباری میرنیشینە کوردییەکانی کوردستانی باکوور وەرنادەم.کەچی ناو بەناو هەڵمەتی سەربازی دەبردنە سەر بەتایبەتی لە راپەڕینەکەی بەدرخان پاشای گەورە لە ساڵی (١٨٤٧)هەروەها لە شۆڕشەکانی شێخ سەعیدی پیران و ئیحسان نووری پاشا لە ساڵانی ١٩٢٥و ١٩٣٠دا لەسەردەمی حوکمی کەمالیەکان و دوای ئەو راپەڕینانە تورکیا کوردستانی باکووری کردە ٢٢ پارێزگا و هەریەکەیان پارێزگاری خۆی هەیە و هەمووشیان بەستراونەتەوە بەوالی گشتی کە لە دیاربەکر (ئامەد)دادەنیشێ.

**دانیشتوانی دیاربەکر**

دیاربەکر شارێکی گەورە و گرانی کوردستانی باکوورە، ژمارەی هەرە زۆری دانیشتوانی کوردن و کەمایەتیەکی بچووکیش لە ئەرمەن و ئاشووری و چەرکەس و تورکی تێدایە.دوای مۆرکردنی پەیمانی بەرلین لەساڵی ١٨٧٨دا سەرژمێرییەکی دانیشتوانی دیاربەکرکرا و دەرکەوت ٨٤٠هەزار کەس لەو شارەدا دەژین، کەچی لەسەردەمی کەمالیەکان ئەو ژمارەیە دابەزی بۆ ٤٣٨ هەزار کەس، چونکە دەستەڵاتدارانی ئەو رژێمە خەڵکێکی زۆریان لەو شارو ناوچەیە دوورخستەوە بۆ رۆژئاوای تورکیا . لەگەڵ ئەوەشدا ئەمڕۆکە ئەم شارە دێرینەی کوردستان لە گەشەکردندایە و بەهێڵی شەمەندەفەر بەشارەکانی رۆژئاوای تورکیا بەستراوە و هەموو جۆرە قوتابخانەیەکی لێکراوەتەوە لەگەڵ(زانکۆی دیجلە)و ژمارەیەکی زۆری مامۆستای زانکۆ لە خاوەن بروانامەی بەکالۆریۆس و ماجستێر و دوکتۆرا هەیە، جگە لەژمارەیەکی زۆر لە پزیشکی پسپۆڕ و ئەندازیار

**هۆزەکانی**

مێژوونووسی کورد ئەمین زەکی بەگ لە کتێبەکەی (مێژووی کورد و کوردستان)دا دەڵێ: ناودارترین هۆزی کورد لە دیاربەکر(ئامەد)ئەمانەن:(تیرەکان-بشری)و(رشکوتانلی)و(شێخ داودانلی)و (بیکرن)و(پووران) و (موشیک) و(سلیڤانی)و(زازا)لە گەڵ هەندێ هۆزی بچکۆلە. (باسیل نیکیتین)یش دەڵێ ژمارەیەکی زۆر لەکوردی ئیزدی لە دیاربەکر نیشتەجێن.

**ژیانی ئابووری**

ئەو شوێنەی دیاربەکر (ئامەد)ی لەسەر دروستکراوە و ئەو دەشتەی کە بەسەریدا دەڕوانێ، خاکێکی بە پیتی هەیە، بۆ کشتوکاڵ گەلێک لەبارە و لەهەندێ ناوچەی پشت ئاوی گەنم و جۆو نۆک و نیسک دەچیندرێن و چونکە ناوچەکە بارانی زۆرە بۆیە بەروبوومێکی زۆر باشی دەبێ.لەو شوێنانەی کە بەراویشن پەمۆ و بەپلەی یەکەمیش برنجی کوردی دەچیندرێ و بە ئاوی دیجلە پاراو دەکرێت، جگە لەمانەش خاکە بەپیتەکەی گەلێک گونجاوە بۆ چاندنی شووتی و هەندێ جار کێشی یەک شووتی دەگاتە ٥٠ کیلۆگرام، بۆیە ساڵانە ئەو شارە گەورەیە پێشانگای شووتی دەکاتەوە لە هەموو لایەکی تورکیا بۆ کڕینی دێن.

دانیشتوانی شارو ناوچەکە لەکۆنەوە هەر خەریکی رەزگەریی و رواندنی دراو درەختی بەبەرن،چونکە هەلو مەرجی رواندنیان تێدا هاتۆتە دی هەر لە ئاوو هەوای سازگارو خاکی بە پیت و ئاوی زۆرەوە تا دەگاتە باغەوانی ئیشکەری مەعلان و گرنگترین ئەو درەختانەیشی دارتوو و هەنار و هەنجیر و سێو و بەهێ و هەڵووژە و چنارو سپیندارن. . .

لەبارەی بەخێوکردنی مەڕو ماڵاتیشەوە، دیاربەکر لەکۆنەوە مەڕو بزن و گاو مانگای شیر دەری لەجۆری هۆڵەندی و پەڕەوڵی بەخێوکردووە و بووەتە مەڵبەندێکی گرنگی بەروبوومی ئاژەڵی و لەسەرێکی دیکەشەوە،



ناوچەی دیاربەکر دەوڵەمەندە بەکانزای گرنگی وەک مس و زیو و بەرادەیەکی کەمیش زێری لێدۆزراوەتەوە و لە ڕێگەی بەنداوی سەر ڕووباری دیجلەوە هێزی کارەبا بۆ دابین کراوە.

لە هەموو سەردەمێکیش ئەم شارە مێژووییە گرنگە مەڵبەندێکی بازرگانی بووە و کاروانی بازرگانی بۆ مووسڵ و بەغدای پایتەختی دوڵەتی عەبباسی لە سەردەمی پێشوو چووە،ئەمڕۆکەش پەیوەندی بازرگانی لەگەڵ هەموو شارە گەورەکانی تورکیادا هەیە بەو ناوەی کە پایتەختی ئیداریی هەرێمی گەورەوگرانی کوردستانی باکوورە و بازرگانەکان لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای تورکیاوە ڕووی تێدەکەن بۆ کاروباری بازرگانی و بەڕێگەی ئاسمانی و هێڵی شەمەندەفەرەوە بەدەرەوە و ناوەوەی ئەو وڵاتە بەستراوەتەوە.

**شوێنەوارەکانی دیاربەکر**

لە ئەورووپا و لەشاری ئەستەمبوولیش شوورە و قەڵای قایم هەبوون، بەڵام هیچ کامێکیان ناگەنە شوورە بازلتییەکەی دەوران دەوری شاری دیاربەکر، چونکە لە هەموویان گەورەتر و دێژتر و جوانترە، هەروەکو لە کتێبەکەی (مهد البشریە)دا هاتووە،بەرزایی دیوارەکانی ئەو شوورەیە دەگاتە ٨ مەتر و پانی ٤





مەترە،درێژایەکەشی ٨میلە و ٨٠ بورجی گەورەی بۆ پارێزگاری شارە مێژووییەکەی لەسەر دروستکراوە و ئەمەش لەسەر شێوەی شوورەکانی ڕۆمانەکان دروستکراوە و لەهەندێ سەرچاوەی مێژوودا دەڵێ:ئەم شوورە گەورە و قایمە دەستکردی ڕۆمە بێزەنتییەکانە.

قەڵاکەی دیاربەکریش کەوتۆتە گۆشەی باکووری ڕۆژهەڵاتی،لە سەر ڕۆخی ڕووباری دیجلەیە و تاکو ئێستاکە شوێنەوارەکەی ئامانجی گەشتکارانە.بەڕاستی دیاربەکری ئەمڕۆ و(ئامەد)ی پێشوو ،شارێکی گرنگی کوردستانی باکوورە و لە هەموو ڕوویێکی مێژوویی و جوگرافی و شوێنەواری و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە،نرخێکی شارستانی هەیە، چونکە لەسەردەمێکی یەکجار کۆنەوە لە شوێنێکی ستراتیژی لە ڕۆخ ڕووباری دیجلەدا بنیات نراوە و دەورێکی مێژوویی لە ژیانی میللەتی کورددا بینیوە و دەبینێ و ڕۆژ بەڕۆژیش لە گەشەکردن و پێشکەوتندایە.

**تێبینی**

* ئەم بابەتە لە کتێبەکەی (المدن الکردیە)ی(ازاد دیرکی)یەوە ئامادەکراوە.

* وێنەکان بەکامیرای گۆڤاری مێرگەوە گیراوە.

# چەمکی ژینگەو جۆرەکانی و پەیوەندییان بە مرۆڤەوە



ژینگە چەمکێکی باوە و زۆر بەکاردەهێنرێ، ماناکەی گوزارشت لەنێوان خۆی و نێوان بەکارهێنەرەکەی دەکات. بۆ نموونە دەڵێن ژینگەی کشتوکاڵی، ژینگەی پیشەسازی،ژینگەی تەندروستی، ژینگەی کۆمەڵایەتی،ژینگەی رۆشنبیری و ژینگەی سیاسی، واتە چالاکیە پەیوەندی دارەکانی مرۆڤ بە هەریەک لەم بوارانەوە.

وشەی (Ecolog)یش بە مانای زانستی ژینگە دێت و زانای ئەڵمانی- ئەرنست هیگل(Ernest Haeckel)لە ساڵی ١٨٦٦ز دایناوە و لە ئەنجامی لێکدانی دوو وشەی یۆنانی پەیدابووە کە (oikes)واتە خانوو و (Logos) بە مانای زانست دێت بە لێکدراویش واتە ئەو زانستەی کە لە پەیوەندی

**■ زاناکان ئێستا لەسەر ئەوە کۆکن، کەوا چەمکی ژینگە هەموو ئەو بارودۆخ و فاکتەرە دەرەکیانە دەگرێتەوە کە زیندەوەرەکان تێیدا دەژین و کار لەو پرۆسانە دەکات کە ئەنجامی دەدەن■**

■ ژینگەش بە هەردوو باڵەکەیەوە (سروشتی و بونیاتنراو) پێکهاتەیەکی گشتی و تۆکمەیە، هەموو گۆی زەوی یاخود ئەستێرەی مرۆڤ نشین دەگرێتەوە لەگەڵ کاریگەری گشت ئەو پێکهاتانەی تری گەردوون و پێکهاتەکانیش بە گشتی وەستاوو چەقیو نین ■

زیندەوەرە گیانیەکان لەگەڵ ئەو نێوەندەدا دەکۆڵێتەوە کە تیایدا دەژین، هەروەها زانستەکە گرنگیی بە زیندەوەرەکان و خۆراکەکانیان، شێوازی ژیانیان و بوونیان لە کۆمەڵگاو کۆمەڵە نیشتەجێکان و گەلاندا دەدات. سەرباری ئەوانە لە فاکتەرە نازیندەگیەکانی وەکو خەسڵەتەکانی ئاوو هەوا (گەرمی، شێ، تیشکدانەکان، گازەکانی ئاو و هەوا) و هەروەها لە خەسڵەتە فیزیاوی و کیمیاویەکانی زەوی و ئاو هەوا دەکۆڵێتەوە.

زاناکان ئێستا لەسەر ئەوە کۆکن، کەوا چەمکی ژینگە هەموو ئەو بارودۆخ و فاکتەرە دەرەکیانە دەگرێتەوە کە زیندەوەرەکان تێدا دەژین و کار لەو پرۆسانە دەکات کە ئەنجامی دەدەن. بۆ نموونە ژینگە سەبارەت بە مرۆڤ واتە ئەو چوار چێوەیەی کە تیایدا دەژی و خۆڵ و ئاوو هەوا و هەموو پێکهاتەکانی ئەو سێ ڕەگەزە سەرەکیە دەگرێتەوە جا پێکهاتە بێ گیانەکان بن یاخود ئەوانەی گیانیان تیایە و دەژین. ئەو چوار چێوەیەش چەندین دیاردەی جۆراوجۆری وەکو کەش، ئاوو هەوا، با، باران، کێشان و مۆگناتیسیەت.. و پەیوەندیە ئاڵوگۆڕەکانی نێوان ئەو ڕەگەزانە لەخۆ دەگرێ.

بۆیە ئاخافتن لەسەر چەمکی ژینگە واتە لێدوان لە پێکهاتە سروشتیەکان و ئەو بارودۆخ و فاکتەرانەی کە زیندەوەرەکانی تیا دەژی، توێژەرانیش ژینگەیان بۆ دوو بەشی سەرەکی دابەش کردووە کە ئەمانەن

١- ژینگەی سروشتی / لەو دیاردانە پێکهاتووە کە مرۆڤ هیچ دەسکەوتێکی لەبوون و بەکارهێنان و دیاردەکانیدا نەبووە وەکو بیابان، دەریاکان، ئاوو هەوا، بەرزی و نزمی زەوی، ئاوی سەر ڕووی زەوی، ئاوی ژێر زەوی، ژینگەی ڕووەکی و



ئاژەڵی، ژینگەی سروشتیش کاریگەریەکی ڕاستەوخۆو ناراستەوخۆی لەسەر ژیانی هەر کۆمەڵەیەکی زیندوو (population)دا هەیە جا ڕووەکی بێ، یا ئاژەڵی، یاخود مرۆیی

٢- ژینگەی دروست کراو (بونیاتنراو) لەو بونیاتە بنەڕەتیە ماددیانە پێک دێت کە ئادەمیزاد دروستی کردووە. هەروەها دەکرێ لەو گۆشەوە لە ژینگەی بونیاتنراو بڕوانین کە کۆمەڵگاکان چۆن شێوەی ژیانی خۆیانی پێ ڕێک دەخەن و توانرا لە ڕێگایەوە ژینگەی سروشتی بۆ خزمەت پێداویستیە مرۆییەکان بگۆڕدرێ، ژینگەی بونیاتنراو هەروەها بەکارهێنانی زەویە کشت و کاڵیەکان و زەوی نیشتەجێ بوون ئەو ناوچانە دەگرێتەوە کە بۆ سامانە سروشتیەکان دەیان پشکنین سەرباری ناوچە پیشەسازیەکان و بنکە بازرگانی و قوتابخانەو ئامۆژگاو زانکۆ و ڕێگەو بانەکان

ژینگەش بە هەردوو باڵەکەیەوە (سروشتی و بونیاتنراو) پێکهاتەیەکی گشتی و تۆکمەیە، هەموو گۆی زەوی یاخود ئەستێرەی مرۆڤ نشین دەگرێتەوە لەگەڵ کاریگەری گشت ئەو پێکهاتانەی تری گەردوون و پێکهاتەکانیش بە گشتی وەستاوو چەقیو نین. بەڵکو کاریگەریەکی بەردەوامیان هەیەو لەگەڵ مرۆڤ خۆیدا کار لە یەکتری دەکەن چونکە مرۆڤیش پێکهاتەیەکی کارای ئەو



ژینگەیە، ئەم لێکدانەوەی پێشوو لە لایەن(یوتانت)ی ئەمینداری پێشووتری نەتەوە یەککرتوەکان دەربڕاوە کە دەڵێ( ئێمە بمانەوێ یان نەمانەوێ هەموومان بەیەکەوە لەسەر پشتی یەک ئەستێرەدا کۆچ دەکەین، هیچ شتێکی تریشمان بەدەستەوە نیە، تەنها کارکردن نەبێ بەیەکەوە بۆ ئەوەی بیکەینە ژینگەیەک، بەڵکو ئێمە و منداڵەکانمان بتوانین ژیانێکی ئارامی تیا ببەینە سەر)

ئەم داواکاریە وا لە ئادەمیزاد دەخوازێ کە تاکە گیانلەبەر و پێکهاتەی ژیری ئەو گەردوونە پان و بەرینەیە بە هێواشی و سۆزەوە مامەڵە لەگەڵ ژینگەدا بکات بەبێ تێکدان و ئەزیەت دانی وەبەرهەمی بێنێ و سوودی لێ وەرگرێ.

دووریش نیە تێگەیشتنی سروشتی ژینگە و پەیوەندیە بەرامبەرەکانی نێوان سەرجەم پێکهاتەکانی بواری ئەوە بۆ مرۆڤ بڕەخسێنێ شوێنێکی تازە و پێش کەوتووترو لەبارتر بۆ ژیانی خۆی و نەوەکانی دواتریش بدۆزێتەوەو ژینگەو دەوروبەرەکەی بەپاک و خاوێنی ڕابگرێ و زیان بە سەرچاوەکانی ژیان و خاک و خۆڵ و ئاوو هەوا نەگەیەنێ و زێدەڕۆیی لە بەکار هێنانی هیچ کامیان نەکاو بەپێی پێویست و توانا بەکاریان بێنێ، بەو هیوایەی ئێمەش لە کوردستاندا سوود لەو لێکۆلینەوە زانستیانە وەرگرین کە گرینگی بە مەسەلەیەکی هەستیاری وەکو ژینگە دەدەن و جەخت لەسەر پاراستن و ئەزیەت نەدانی دەکەنەوە لە پێناو جوان ڕاگرتنی ژینگەی وڵاتە شیرینەکەمان و ئەزیەت نەدانی و دەست گرتن بە سەرچاوە سروشتیەکانی. و دابین کردنی ژیانێکی خۆش و ئاسوودە بۆ خەڵکی کوردستان.



# دووباره بەکارهێنانەوەی پاشماوەکان وەک فاکتەرێک بۆخاوێن کردنەوی ژینگە

تاهیر عوسمان

ئێمە ڕۆژانە کەرەستەو کەلوپەلێکی بێ کەڵک و لەکار کەوتووی جۆراوجۆری زۆر تێکەڵ دەکەین و فڕێیان دەدەین، بەبێ ئەوەی بیر لەوە بکەینەوە کە ئایا ئەو ماددە تووڕ هەڵدراوانە تا چەند زیان بە ژینگەودەوروبەرەکەمان دەگەیەنن و دەبنە هۆی ناشیرین کردنی سیمای شارەکان و بێز لێ کردنەوەیان و چ زیانێکی گەورەش بە ئابووری وڵاتەکەمان دەگەیەنن، چونکە ئەگەر بە وردی لە تێچوو و خەرجی دروست کردن و بەرهەمهێنانی پەڕە کاغەزێک و قووتویەکی شیری منداڵان وشووشەیەکی ساردی و پەرداخێکی پلاستیک وردبینەوەو بزانین بەچ شێوەیەک هاتوونەتە بەرهەم و کەوتوونەتە بەردەستمان،

ئەوە هەرگیز بەم کەمتەرخەمی و گوێ پێنەدانە بەیەکەوە لوولیان نادەین و هەوڵ دەدەین بۆ زۆرترین ماوە سوودیان لێ وەربگرین و دوای لە کارکەوتن و بێ سوود بوونیشیان بە جیا کۆیان بکەینەوەو بۆ شوێنی مەبەست و دووبارە دروست کردنەوەیان ڕەوانە بکەین.

کەواتە ئەو تێکەڵی و ئاڵۆزیەی ئێمە ڕۆژانە لە کۆکردنەوەی زبڵ و پاشماوەکان پیادەی دەکەین، نەوەک هەر شێوەیەکی شارستانی نیە، بەڵکو زیان بە ژینگەو ئابووری وڵات و تەندروستی هاووڵاتیان و سیمای جوانی شارەکان دەگەیەنێ، بۆیە دووبارە بەکارهێنانەوەی ماددەیەک (Reuse) کە بەهەنگاوی نێوان بەکارهێنان (use) و دووبارە دروستکردنەوەی ماددە سەرەکیەکە (Recycling) دادەنرێ، هەنگاوێکی کاراو ئابووری ترە، چونکە لە لایەک تێچووی کەمترە لەلایەکی دیکە قەبارەی پاشماوەو زبڵەکان کەمدەکاتەوە و ئەو نارێکیەی کۆکردنەوەی زبڵەکانیش بەو ناشرینیە بەرچاو ناکەوێ کە ئێستا هەیە و دەکرێ دەست بە بەکار هێنانی زیاد لە پێویستی هەندێک ماددەوە بگرین، کە ئێمە ڕۆژانە زیادەڕۆیی لە بەکارهێنان و بە فیڕۆدانیان دەکەین و هەستیش بەو زیانە زۆرە ناکەین کە لەو زیادەڕۆییە دەکەوێتەوە.

بۆ نموونە ئێمە لە ژیانی ڕۆژانەماندا زیاد لە پێویست کاغەز بەکاردەهێنین چ وەکو ڕوژنامەو گۆڤارو کتێب کە بەشێکی زۆری ئەو بڵاوکراوانەش زیاد لە پێویست چاپ و دابەش دەکرێن، هەروەها کاغەزێکی زۆر لە نامەناردن و نووسراوی ناو فەرمانگەو قوتابخانەو زانکۆکان بەکار دەهێنین کە زۆر پێویستە لە پێناو پاراستنی



ژینگەی وڵاتەکەمان دەستی پێوەبگرین و تا بکرێ بۆ نامەناردن شێوازی پێش کەوتووی وەکو (**E-mail**) بەکار بێنین، یا لە کۆپی کردنی نووسراوو نامەکاندا لەسەر هەردوو رووی کاغەزەکان بنووسین و کۆپی بکەین و بەدەفتەرو کتێبە کۆنەکانیشماندا بێینەوە و دووبارە بە کاریان بێنینەوە یاخود لە جیاتی کڕین و بەکارهێنانی دەفتەری تازە پەڕەکۆنەکان بەیەکەوە چەسپ بکەینەوەو دەفتەری بچووکی گیرفانی لێ دروست بکەین کە بۆ زۆرشت بە کەڵک دێن تا بکرێ لە ماڵ و فەرمانگەکاندا کارتون و مەقەباکان فرێ نەدەین و دووبارە بەکاریان بهێنینەوە.

هەوڵ بدەین روژنامە کۆنەکان و کاغەزەکانی کۆمپیوتەر بۆ داپۆشینی کەلوپەل و خۆراک بەکاربێنین، بۆ دووبارە سوود وەرگرتنەوە و چارەسەرکردنی ئەو کاغەزە زیادانەی کە ئێمە رۆژانە فرێیان دەدەین دوو جۆرە کاغەزمان هەیە، یەکەمیان کاغەزی دوابەکاربردن (**Post Consumer**) وکاغەزی بەر لە بەکار بردن (**Per-Consumer**)، حاڵەتی یەکەمیش ئەو کاغەزانە دەگرێتەوە کە بۆ دووبارە دروستکردنەوە کۆدەکرێنەوە، بەڵام حاڵەتی دووەم ئەو پارچە کاغەزە وردانەیە کەلەکاتی دروستکردنی پارچەکاغەزی گەورەو



پاشماوەی چاپخانەکاندا دەمێننەوەو دووبارە دەبردرێنەوە ناو کارگەکانی کاغەز، وەدەتواندرێ شەش جار سوود لە دەزوولەکانی کاغەز وەربگیرێ بەر لەوەی زۆر بێهێز ببێ و کەڵکی نەمێنێ، کەواتە دەکرێ پاشماوەکان وەکو کەرەستەیەکی خاوی پیشەسازی بەکاربێنینەوە ئەو دووبارە بەکارهێنانەوەیەش برێکی زۆری وزەو سەرچاوەکان پاشکەوت دەکات.

بۆنموونە دووبارە بەکارهێنانەوەی تەنێک کاغەزو کارتۆنی کۆکراوە (١٧)داری گەورەو(٢٢٧١٢٥) لیتر ئاوو(٤٢٠٠) کیلۆوات کارەباو (٤)بەرمیل سووتەمەنیو(٤.٢)مەتر سێجا لە پاشماوەکان و (٢٨)کیلۆگرام لە هەوای پیس دەگەڕێنێتەوە. هەروەها دروست کردنی کاغەز لەمادە دووبارە بەکارهێنراوەکان پیس بوونی ژینگە بە رێژەی(٧٤٪) و پیس بوونی ئاو بە رێژەی (٣٥٪) کەمدەکاتەوە. لە هەمان کاتدا هەروەک بەراوردێک لەگەڵ ژمارەکانی سەرەوە دروستکردنی تەنێک لە کاغەزی تازە، پێویستی بە (١٦٧٣)کیلۆگرام دارو (٩١٠٠٠) لیتر ئاوو (٩٨)کیلۆگرام کلس و (١٦٣) کیلۆگرام قالب خوێ و (٣٤) کیلۆگرام خۆڵەمێشی سۆدا هەیە.لە پاڵ پێویستیچارەسەرکردن و فڕێدانی (٣٨) کیلۆگرام لە هەوای پیس و (٢٠) کیلۆگرام ئاوی پیس و بۆگەن و(٨٠) کیلۆگرام لە پاشماوە رەقەکانی دار کە بەکەڵکی هیچ نایەن و پێویستە ژینگەیان لێ بپارێزین، وەنەبێ دووبارە بەکارهێنانەوەی کەلوپەلە لەکارکەوتووەکان و دووبارە دروستکردنەوەیان هەرتەنها تایبەت بێ بە کاغەزەکۆن و کارتۆنەوە، بەڵکو هەمان رێوشوێن بەسەر ئەلەمنیۆم و شووشە و

نایلۆن و پلاستیکیشدا دەچەسپێ. لەوانە دەتوانرێ هەریەک لە ئەلەمنیۆم و شووشە چەندین جاری ترو بەشێوازی جیا بەکاربهێنرێتەوە، بەر لەوەی تێک بشکێندرێ و فرێ بدرێ یاخود بۆ دووبارە دارشتنەوەو لە قالب گرتنیان بەرەو کارگەکان ببرێن. دەرکەوتووە ئەو وزەیەی بۆ دووبارە دروست کردنەوەی پەرداختێکی شووشە خەرج دەکرێ، دەتوانێ بۆماوەی چوار کاتژمێر گلۆپێکی (١٠٠)واتی دابگیرسێنێ و ژوورێک رووناک بکاتەوە.

هەرتەنێکیش لە شووشەی دووبارە بەکارهێنراوە(٦٠٠)کیلۆگرام قوم و (١٩٦)کیلۆگگرام خۆڵەمێشی سۆداو(١٩٦) کیلۆگرام بەردی کلس و (٦٨) کیلۆگرام سلیکاتی ئەلەمنیۆم دەگێرێتەوە، هەروەها بەرهەم هێنانی تەنێک شووشە لەماددە خاوە ئاساییەکانی(١٧٤) کیلۆگرام پاشماوەی وردەئاسنی لێ دەکەوێتەوە، سەبارەت بە دووبارە بەکارهێنانەوەی قووتوی ئەلەمنیۆمیش رێژەی(٧٥٪)ی وزەی بەکاربراوو(٨٥٪)ی پیس بوونی ژینگەو (٧٦٪) پیس بوونی ئاوو (٩٥٪)ی پاشماوە رەقەکان کەمدەکاتەوە، ئەوە ئەگەر ئەلەمنیۆم لە ماددە خاوە ئاساییەکانی خۆی دروستکرا.

هەروەها دووبارە بەکارهێنانەوەی تەنێک ئەلەمنیۆم وزەیەک پاشکەوت دەکات کە بەرامبەر(٨٨٩٦)لیتر بەنزین دەبێت، بەڵام ئەگەر ئەو برە ئەلەمنیۆمە لە ماددە خاوە ئاساییەکانی دروست کرا ئەوە پێویستی بە چارەسەرکردنی (٣٢٩٠) کیلۆگرام قوری سوورو (١٣١٥)کیلۆگرام گازی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن و (٣٦)



کیلوگرام هەوای پیس و (٣٥٨) کیلۆگرام پاشماوە رەقەکان دەبێت.

کەواتە جێگای خۆیەتی تا بکرێ زیادەڕۆیی لە بەکارهێنانی ئەومادانە نەکەین و لەکاتی کۆکردنەوەی زبڵ و پاشماوەکانیش شێوازێکی زانستی و گونجاو پیادە بکەین بەوەی کە ماددە بێ کەڵکەکان لە یەکتری جیا بکەینەوە، چونکە هەریەک لەم ماددانەکە پێکهاتەیەکی کیمیاوی جیایان هەیە وشیکردنەوەو تێکەڵ بوونیان بەیەکەوە زیانیان بۆ سەر ژینگە زیاتر دەبێ و دەبنە هۆی ژاراوی بوونی ئاوی ژێر زەوی و بە هەوادا دەچن و کاریگەری زۆر خراپیان بۆسەر تەندورستی مرۆڤ دەبێ.

بەو هیوایەی لەمەودوا رێوشوێنی دروست بۆ کۆکردنەوەو جیا کردنەوەی زبڵ و پاشماوەکان بگرینە بەرو کارگەو دامەزراوە تایبەتیەکانیشمان بتوانن سوود لە کەلوپەلە لە کار کەوتوەکان و فرێ دراوەکان وەربگرین، دووبارە درووستیان بکەینەوەو کەلوپەل و کاڵای جوانتر و چاکتریان لێ دروست بکەن.

لە پێناو ژینگەیەکی پاک و ئابووریەکی بە هێزو ژیانێکی ئاسوودە بۆ سەرجەم خەڵکی کوردستان .



# سوار سوارانێ و قۆشەن و قۆشمەسازی

ئەحمەد حەمەدەمین

لە کوردەواری وشەی سوار یاخود دەستەواژەی سوار سوارانێ باوە، وشەیەکە یەکسەر خەیاڵی مرۆڤ بۆ لای ئازایەتی و داستان و قارەمانییەتی دەبات، گەلێ جار گوێ بیستی قسەی(سوار تا نە گلێ نابێ بە سوار) و (تاقە سوار تۆزێ ناکات)،یا لە یاری دامە دەگوترێ (ڕێزم سوارە) یان تفەنگچی دەڵێ: تفەنگم سوارە، یان دەگوترێ سواری

خەڵكی هەر پیادەیە، دەیان وێنەو نموونەی تر لەم چەشنە لەنێو گوتەو زمانی كوردی بەدیدەكرێ.
سوار بە مانای ئامادە، ساز، كۆك،دێت، بۆیە سوارو سوار سوارانێ كۆمەڵێك تەدارەك و ئامرازو كەل و پەلی تایبەت بەخۆی هەیە، هەروەها سواری ناو سواران، ئەویش چەندین خاڵ و مەرج و سیفەت و خاسیەتی تێدایە، لە كۆنەوە ئافرەتی كوردەواری كاتێ منداڵی ساوای لاواندۆتەوە و گۆرانی بەسەردا هەڵداوە، هیواو ئاواتیان خواستووە كوڕەكەیان ببێ بەسوار و لە گۆڕەپانی پێشبڕكێ و رمبازێ دا ببێ بە پێشەنگی تاقمی سواران بۆیە گوتویانە:

**سوارە لەپێش قۆشەنێ**
**خارو مامی دەگەنێ**
**یەک و کیژی دەدەنێ**

قۆشەن واتە لەشكر، ئافرەت تامەزرۆی ئەوە بووە رۆڵەكەی پێبگات، لە پێش لەشكر سوارێكی چاپووک و قۆشمەبازی لێدەرچێ،

گۆرانی بەسەرهات و رووداو، كە گیانی ئازایەتی و قارەمانی دەوروژێنێ، تەژی و پڕە لەمجۆرە نموونانە، نەک هەر لە سترانی شادی و بەختەوەری، بەڵكو لە گۆرانی ئیشوكارو بۆنەی دڵتەنگ و كارەسات و رووداوی ناخۆش، لە شیوەن و پرسەدا، ئافرەتان بە رۆڵەی سوارچاک و مەرد و چاونەترسیان هەڵداوە، گەلێ جار بۆ مرۆڤی مێرخاس و بەتواناو خاوەن قۆناغ و بنەمای كۆمەڵایەتی، یاخود كەسانی ئاسایی سوار چاک و ئازا كۆتەڵیان سازداوە بۆیان مەینەتبارو نیگەران بوونە، شیوەن و چەمارۆیان بۆ كردوون

**ئەو ناربەندەم كوڕە كوردە**
**ناران لێدەن هوردە هوردە**
**سوار هاتن لەشكر گردە**
**كەسم نما هەولێر گردە**
**كەسم نما ئەسپی غوردە**
**كەسم نما نسكۆی بردە**
**كەسم نما سواری مەردە**

سواری ئازا لە بۆنەو بەسەرهات و



ڕووداوەکـــان بەهرەو توانایان دەرکـــەوتووە، لەکـاتی ڕاوکـردن و بووک گـواســتنەوەدا یان لەشەڕو بەسەرهات دا لێوەشاوەیی و شارەزایی سوارچاکان ئاشکرا بووە، جاران لەبۆنەی بووک گـواسـتنەوەدا کـۆمـەڵێک سـواری چاپووک و لێـوەشـاوە، لەپێش وراغی بووکێ قۆشـمـە و جلیتبازی و غـارغـارێنیـان کردووە، گۆرانییـان گـوتووەو پێـشـبـڕکێ و ڕکـەو سـواربـازیان سـازداوە، خـەڵک هەیە دیوبەتی سـوار لەبای غـارێ، چەکی فـڕێداوەتە ئاسـمـان تەقـڵـەی بە تفەنگەکە لێداوە و گرتوبەتییەوە، سوار هەبووە زۆر بە خێرایی بەتاو هاتووە و کڵاوی لە زەوی هەڵگرتۆتەوە.

لە داستان و بەسەرهاتەکانی قارەمانییەتی و ئەڤینی، سـوار چاکی عـەگـید و مـێـرخـاس دەرکـەوتوون، گـەلێـک قـارەمـان و سـوار چاک هەنە، ئێـسـتـاش وەک نموونە ناویان ئامـاژەی پێدەکرێ، سوارچاکی بە تەنیـا لێهـاتوویی بۆ مـرۆڤ ناگـەڕێتەوە، بەڵکو نیـوەی بۆ جـۆری ولاخەکە دەگەڕێتەوە، لەسوار سوارانێ ئەسپ و مـاینی ڕەسـەن و پەسند ڕۆڵی خـۆیان دەگـــێـــڕن،دیارە ولاخی جـــســن تایبـەتمەندی و مـەرج و بنەڕەتی خۆی هەیە.

**مەرجەکانی ولاخی ڕەسەن**

*** هەسـتـیـارو چاپووک.**

لـە دوورەوە تـا مـــــــــەودای (٣٠٠)مـــەتر هەست بەبوونی ڕێـگرو نـاحـــەزو گـــیـــانەوەری دڕندە دەکـات، دەپڕمـێنێ و گـوێی قـولاغ دەکـاو گـۆڕان لە جـوولەو لەشی ڕوودەدات،بۆیە هەڵدەسـتـێتـەوە سـەر پاشـوو دەحـــیـلێنێ هەردوو قـاچی پێـشـــەوەی بەرز دەکاتەوە و چەپۆک دەوەشێنێ.

*** چاونەترسی و سل نەکردن.**

لە کـاتی ڕمبـازێ و غـاردان تفـەنگی پێـوە بنێی سل ناکاو لە گووره ناچێ و ناشێوێ.

*** وەفاو نمەک خوانی.**

کە سوار گلا یاخود بریندار بوو دەگەڕێتەوە سەری و دۆش دەمێنێ، تەنانەت پاڵدەکەوێ تا خاوەنەکەی بچێتەوە سەرپشتی.

*** سوارناس و هێمن.**

ســـوارچاک دەناسێ، پشـــتـی چاڵ دەکــاو هێمن دەوەستێ، ئەگەر سوار خراپ بێ تووکی لێدێ و شووم و سەرشێت دەبێ.

**شوێنناس و شارەزا.**

خــاوەنی هەڵە بکاو شـوێن بزر بێ، ڕێگاو مـاڵ و شـوێن دەناسـێتـەوە، لەشـەڕ دەتوانێ بریندار بێنێتەوە.

*** سەبوورو خۆڕاگر.**

هەرچەندە برسی بێت دان بەخـۆ دەگـرێ و بەرماوەی بۆگە ناخوات

*** دەرک بەرو توانادار.**

هێــزو توانای خــۆی دەزانێ، لەخـۆی ڕانەبینێ بازنـاداو خـــۆی و خـــاوەنی بە فـەتارەت نابات، لە مـێـشـکی خـۆی شوێنی بازدانەکە کە دەپێوێ.

*** لە بواری ئاســایی بەردەوام ڕەو دەکات**



**جیاوازی ماین و ئەسپ**

لەســوار ســوارانێ مــاین و ئەسپ بەکـار دێت، کە دوو بەرزە ولاخـی دیـارو بـەرچـاون هـەریـەک لەمـانە خـاسـیـەت و ئاکـاری تایبـەتمەندی هەیە..

* ماین لە ئەسپ پشوو درێژترو هێمن ترە
* ئەسپ فیلاوییە لە کاتی توورەبوون هەڵدەستێتە سەر پاشوو چەپۆک دەوەشێنێ، ماین ئەم خاسیەتەی نییە ماین دووربین و هەستیارە، ئەسپ لەخۆباییە بۆیە کەم ئاگایە.

## جۆرەکانی ولاخی بەرزە

ولاخی رەسەن و جسن چەند رەنگ و جۆری هەیە، ئەمانە لەناو ولاخان بە توخمی نایاب و دەگمەن دەژمێردرێن ، لەمیانی گوێگرتن لە لاوک و گۆرانی و داستان و بەسەرهاتەکانی ئەڤینی و قارەمانییەتی ناوی ولاخ و توخم و جۆریان دیار دەکەوێ لەوانە:

*** کەوێت یا کوێت**
*** بۆرە**
*** شێ**
*** سەگلاو**
*** قەڵە باڵداری بەحری(ولاخی حەسەنی والیکێ لە لاوکی گەنج خەلیل)**
*** تێلی عەیشان (ولاخی چەتۆ لە لاوکی چەتۆو فەرحۆ)**
*** دامرقەلی(ولاخی گەنج خەلیل)**
*** بێزوت**
*** جان جان**
*** شێ غەزال ( لە لاوکی لاس و خەزال)**

## خاسیەتەکانی سوارچاک

سوار چاک چەند پێداویستی و خاسیەتی تایبەتی هەن.

لەوانە ئازایەتی و بە جەرگی، خوێن گەرم و راستگۆیی و بە وەفایی، نەرم و مەند و لەسەرخۆ، چووست و چالاک و لێوەشاوە، دڵفراوان و چاوکراوە و داوێن پاک، بەزەیی و بەتەنگ لێقەوماوانەوە بێت، جەستەی توندو تۆڵ و تێکچەقیو بێ، سوار دەبێ شایانی هەڵگری نازناوی سوارچاک و شۆرە سوارو بووکا سواران بێت، هەروەها پێویستی بە ولاخێکی خۆشبەز و رەوهان هەیە کە زین و بەرو لغاو کرابێ، رکێب وتەدارەکی تەواو بێت تەنگەوبەری توندو شەتەک بێ، سوار زۆر جار بەولاخەکەی دەناسرێ نەک بەسەرو سیمای خۆی، سوارچاک ولاخی خۆی خۆشدەوێ و لەسەیرکردنی تێرنابێ لەخۆی زیاتر ئارەزوو ناکات کەسی تر بچێتە سەرپشتی، سوار پێدەخاتە ئاوزینگ و دەست بە قەڵبۆزی زینەوە دەگرێ و سواری ولاخەکەی دەبێ، سواری شارەزا ولاخ تەنگاو ناکات سەرەتا جڵەوی بۆ شۆڕدەکات تا دەکەوێتە پێهەڵگرتن و نەرمەغار، کاتێ گەرم داهات و ئامادەی غار بوو جڵەو توند دەکات و رکێب لێدەدات خۆی توند دەگرێ دەنگی دەداو جار جارە سەرە قامچی بەرەو دوواوە رەوان دەکات، سوار چاک ئەوەیە جینگزترین ولاخ نەرم بکات و سواری پشتی بێت، ئەگینا بە (کەرسوار) یان(سواری تازیان) ناو دەبردرێ، سوارچاک لەپڕ بۆ نەیارو ناحەزی ناچێت، بەڵکو ئاگاداری دەکاتەوە جاران ئەوەی لە مەیدانی جەنگ بکوژرایە هەیاسەی پشتی بۆ ئەو کەسە بوو کە لێیداوە، سواری جەنگ و سواری پێش بووک و راوشکاری جیاوازن لەیەکتری هەریەکە تایبەتمەندی خۆیان هەیە.


**سەرچاوە**

* سوارچاکی لە لاوکی کوردەواریدا، محەمەد کەریم شەریف، دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی، بەغدا، چاپخانەی ئەسعەد، ١٩٧٨
* مێرگ - فۆلکلۆری کوردو سروشت،حەسیب عەبدولقادر قازی، چاپخانەی حوادث،بەغدا، ١٩٩٠.






# کێشەی کورد و گەمەیەکی دیکەی سیاسی بەریتانیا

کەریم شارەزا

## ئەڵقەی دووەم

کێشەی کورد بە درێژایی مێژووی نوێی، گەلێک هەڵکشان و داکشانی بە خۆوە دیوە و لە پاش بڕانەوەی جەنگی یەکەمی جیهانی لە دوا دوای (ساڵی ١٩١٨)ەوە کەوتووەتە نێو مەیدانی گەمەی سیاسی بەریتانیای داگیرکەری کوردستانی باشوور و عێراقی عەرەبی.

لە سەرەتادا لەبەر رووناکی بەندەکانی ٦٢ و ٦٣ و ٦٤ی پەیمانی (سیڤەر) کە لە ١٩٢٠/٨/١٠دا لە نێوان دەوڵەتی عوسمانی و هاوپەیمانە سەرکەوتووەکان بەسترا، کێشەی کورد بەرەو چارەسەرکردن چوو، چونکە ئەو سێ بەندە لە مافی چارەنووسی کوردەوە دەدوان. بۆیە مەسەلەی کورد بووە تەوەری هەڵس و کەوتی بەریتانیای مونتەدیب لەگەڵ مەلیک فەیسەلی یەکەمی مەلیکی عێراقی عەرەبی دا.

چونکە دەیانبینی بزووتنەوەکەی مستەفا کەمال لە تورکیا بەرامبەر بە سوپای سوڵتانی

عوسمانی پشتگیریکراو لە لایەن هاوپەیمانان و هێزەکانی یۆنان لە بەرەی رۆژئاوای تورکیا، رۆژبە رۆژ سەرکەوتنی وەدەست دەهێنا و پەیوەندی لەگەڵ (رووسیای بۆلشەویک) دا هەبوو. بۆیە بەریتانیا لە رقی تورکیا کێشەی کوردی هێنایەوە ئارا و ویستی یارمەتی دروستبوونی کیانێکی سیاسی بۆ کورد بدات و پشتگیری بکات. ئەمەش لەبەر دوو هۆی سەرەکی بوو.

یەکەم: ترساندنی تورکیای کەمالی کە تازە بەرەو دروستبوون دەچوو.

دووەمیش: گوشارێک بوو بۆ سەر حکومەتەکەی مەلیک فەیسەلی مەلیکی عێراق تاکو ناچار بێت پەیمانێک لەگەڵ بەریتانیادا ببەستێ و بەریتانیا دەستی کراوە بێ لەدەست تێوەردانی کاروباری عێراق و وابوو لە ساڵی ١٩٢٢دا ئەو پەیمانەی بەست و لە ١٩٢٤دا ئەنجومەنی دامەزراندنی عێراق متمانەی پێدا. جا بەریتانیا بەر لەوەی ئەو دەستکەوتانەی بێتە دەست، کەوتە گفتوگۆ کردن لەگەڵ مەلیک فەیسەل و لە رێگەی مەندووبی باڵای بەریتانیا (سێر پرسی کۆکس)ەوە تێی گەیەنرا کە دروستبوونی کیانی سیاسی کورد لە کوردستانی باشوور لە بەرژەوەندی عێراق و حکومەتەکەی مەلیک فەیسەل دایە، بەوەی کە حکومەتێکی دۆستی لە تەنیشتی دروست دەبێ و دەبێتە بەربەستێک لە بەردەم پەلاماردانی حکومەتی تورکیا کە جاران کوردستان و عێراقی عەرەبی سەر دیجلە و فوراتی لە ژێر دەستی دابوون.

لە یەکەم هەنگاویدا مەندووبی باڵای بەریتانیا لە عێراق سێر پرسی کۆکس، وەزیری موستەعمەراتی ئەوسای دەوڵەتەکەی (ونستۆن چەرچل)ی لە گفتوگۆکانی لەگەڵ مەلیک فەیسەل مەلیکی عێراقدا ئاگادار کردەوە و بروسکەیەکی بە ژمارە (٦١٦) لە رۆژی



٢٥/١٠/١٩٢١دا بۆ چەرچل لێدا و نووسی: من و یۆنگ بە ئامادەبوونی (کۆرنوالیس)ی دیپلۆماتکار، گفتوگۆمان لەگەڵ مەلیک فەیسەلدا لە بارەی کێشەی کوردەوە کرد و پێمان گوت: سیاسەتی ئێمە پشتگیری کردنی نەتەوەی عەرەبە نەک ئیمپریالیەتی عەرەبی و دەبێ ئەوە بزانرێ کە ئەو زنجیرە بەرزاییەی پێی دەگوترێ (حەمرین) عەرەب و غەیرە عەرەب لێکدی جیادەکاتەوە بەشی دوایی (واتە: بەشی باکوور) هی کوردە جگە لە کەمایەتیەکی بچووکی تورکمان و بۆ مەبەستی وتووێژ، بەو هەرێمەی دەکەوێتە پشت ئەو هێڵە (واتە: حەمرین) بە کوردستان ناوی دەبەین. بۆ عێراقیش دروستبوونی کوردستانێکی دۆست کارێکی باشە، چونکە دەبێتە بەربەستێک بۆ عێراق و لە مەترسی تورکیای نوێی دەپارێزێ کە بەرەو دروستبوون دەچێ. دۆستایەتی کوردستانیش لەگەڵ عێراق کارێکی گرنگە و دەبێتە بازارێکی زیندوو بۆی. کاتێک کە



مەلیک فەیسەل لە نیازی بەریتانیا گەیشت کە خەریکی پشتگیری کردنی کێشەی کورد و دروستبوونی کیانی سیاسی ئەو میللەتەیە و جیددییە لە مەسەلەکە. چەند پرسیارێکی ئاراستەی مەندووبی باڵای بەریتانیا سێر پرسی کۆکس کرد وەک ئەمانەی خوارەوە:

١. ئایا بەریتانیای مەزن پارێزگاری کورد دەکات، گەر لە دەرەوە هێرشی کرایە سەر؟ ئەگەر وەڵامەکە پۆزەتیڤە تا چەند ئەو پارێزگارییەی لێدەکات؟ تا چ رادەیەکیش پارێزگاری لە عێراق دەکات لەهەر هێرشێکی لە رێگەی کوردستانەوە بکرێتە سەری؟

٢. ئایا بەریتانیای مەزن ئامادەیە بۆ رێگەگرتن لە هەراوهۆریای ناوخۆ لە کوردستان کە ئەمەش مەترسی بۆ عێراق دەخولقێنی؟ گەر وەڵامەکە پۆزەتیفە تا چ رادەیەک بەریتانیا دەوری دەبێ؟

٣. ئەگەر هاتو هەندێ کورد ویستیان هەر لەگەڵ عێراقدا بمێننەوە، ئایا بەریتانیا ناچاریان دەکات لە عێراق جیا ببنەوە؟

٤. کاتێک کە کوردستان لە عێراق جیا بووەوە، ئایا بەریتانیای مەزن چ جۆرە سیستەمی حوکمی بۆ پێشنیاز دەکات؟ ئایا دوا مەبەستی لەمەدا چییە؟

لە ئەجندەی بەریتانیا مەبەست لە کوردستان کە لە پرسیارەکاندا هاتووە، کوردستانی باشوورە، واتە: ئەو کەوانە وڵاتەی کە کورد لێی دەژی و دەکەوێتە باشووری سنووری عێراق - تورکیا و رۆژئاوای سنووری ئێران هەروەک لە پەیمانی سیڤەر ئاماژەی بۆکراوە.

(سێر پرسی کۆکس)ی مەندووبی باڵای بەریتانیا لە وەڵامی پرسیاری (یەکەم و دووەم) ی مەلیک فەیسەلی یەکەمدا دەڵێ:

وەزارەتی جەنگی بەریتانیا، چونکە سەرپەرشتی بەرگری کردن لە عێراق دەکات و هێزی ئاسمانیش یاریدەی دەدات، ئەو دوو لایەنە بەرپرسن لە گرتنە ئەستۆی ئەو دوو ئەرکەی لە پرسیارەکاندا هاتوون.

هەروەها کۆکس لە وەڵامی پرسیارەکانی سێیەم و چوارەمی مەلیک فەیسەڵدا دەڵێ:



ئەم دوو ئەرکە لە ئەستۆی وەزارەتی موستەعمەراتە. هەروەها لەناو ئەو ئاو و هەوایەی گەمە سیاسییەکەی بەریتانیا لە کوردستان، شێخ مەحموودی حەفید لە ژیانی دیلی لە هیندستان ئازاد کرا و هاتەوە کوردستانی باشوور و لە پایزی ١٩٢٢دا گەیشتەوە سلێمانی و کابینەی دووەمی حکومەتەکەی دامەزراند و لە ١/١١/١٩٢٢دا خۆی کردەوە مەلیکی کوردستان و، بەریتانیا و حکومەتی مەلیک فەیسەل دانیان بەو واقیعەی کورد دانا. بەڵام ئەم گەمە سیاسییەی بەریتانیا وەک گەمەکانی دیکەی تاسەر بە ئیجابی نەچووە پێشەوە و زۆری پێ نەچوو بەرژەوەندییەکانی ئەو دەوڵەتە زلهێزە لەم وڵاتەدا وایان لێ کرد سەبارەت بە نەوتی کەرکووک کە دوای چەند ساڵێک دەست بە دەرهێنانی کرا و دەبوایە بە بۆری بگەیەنرێتە سەر دەریای سپی ناوەڕاست لە ویوەش بنێردرێ بۆ دەوڵەتان، ئەم بەرژەوەندییە وای لە کاربەدەستانی بەریتانیا کرد بیر لە کێشەی ویلایەتی مووسل بە کوردستانی باشوورەوە بکەنەوە و لە پێناوی بەرژەوەندی ئابووری سیاسییان حەز بکەن بە عێراقی عەرەبییەوە بلکێنرێ نەک کیانێکی سیاسی لە کوردستانی باشوور دروست بێ بە تایبەتی کە بینیان لە ٢٤/٧/١٩٢٣دا پەیمانی (لۆزان) لە نێوانی دەوڵەتە هاوپەیمانەکان و تورکیای نوێ بەسترا و هەموو ئەو بەندانەی پەیمانی (سیڤەر) کە پەیوەندییان بە مافی چارەنووسی کوردەوە هەبوو سڕانەوە و لە سەرێکی دیکەشەوە بەریتانیا بەو هەڵوێستەی بەرامبەر بە چارەسەرکردنی کێشەی کورد و دامەزراندنی کیانی نەتەوەیی هاویشتی، حکومەتە ساواکەی مەلیک فەیسەلی پێ ترساند تاکو پەیمانی ١٩٢٢ی نێوانی بەریتانیا و عێراق ببەستی و بەریتانیا ببێتە سەرپەرشتکاری کاروباری عێراق و پارێزگاری کردنی لە هەڕەشەی دەرەوە بە تایبەتی تورکیا و ئێران.

کە بەریتانیای داگیرکەری عێراق گەیشتە ئامانجی خۆی لە نەوتی کەرکووک و پەیمانە دوو قۆڵییەکەی لەگەڵ عێراقدا، لەچارەسەرکردنی کێشە رەواکەی کورد پاشگەز بووەوەو کۆتایی بەو گەمە سیاسییەی خۆی هێنا. هەرچەند ئەوساکە کورد نەگەیشتە ئاواتی نەتەوەیی خۆی، بەڵام ئەم گەمە سیاسییەی بەریتانیا بەرامبەری کردی بۆی بووەتە بەڵگەیەکی مێژوویی لە خەباتی بێ وچانی نەتەوەیی لە پێناوی بنیاتنانی کیانێکی سیاسی بۆ کوردستانێکی ئازاد و سەربەخۆ.


**سەرچاوەکان:**

١. السيد عبدالرزاق الحسني- تأريخ العراق السياسي الحديث، ص ٢٨٠.

٢. عزيز الحاج- القضية الكردية في العشرينات- بغداد ١٩٨٥، ط (٢) ص١٨٨، ١٩٦.

٣. د. عەبدولڕەحمان قاسملو- کوردستان و کورد- وەرگێڕانی عەبدوڵڵا حەسەن زادە، ل٥٤.

# لیبرالییەتی نوێ و پرنسیپەکانی

لەم سەردەمەماندا زاراوەی لیبرالییەتی نوێ کەوتۆتە نێو ئەدەبیاتی رێکخراو و پارتە سیاسییەکانی جیهان و لێرەدا گرنگترین پرنسیپ و بنەماکانی ئەم چەشنە لیبرالییەتە دەخەینەڕوو کە ئەو جۆرە رێکخراوە سیاسییانە پەیڕەوی دەکەن و جیاوازییەکانیان لەگەڵ لیبرالییەتی ئاسایی کە تا ئێستا زانیومانە دەردەخەین و کەمێک تیشکی زانیارییان دەخەینە سەر.

پرنسیپی لیبرالییەت لەسەرەتای پەیدا بونییەوە لەسەر بنچینەی تێکشکاندنی ئەو کۆت و زنجیرانەی کۆمەڵگای کۆنیان دەبەستەوە دامەزراوە، کە رێگەیان لە بیرکردنەوەی تاک دەگرت و لە لایەکی تریشەوە پیاوە ئایینیەکان خۆیان سەپاندبووە سەرباری ژیانی رووناکبیریی و کۆمەڵایەتی کۆمەڵگا و لیبرالییەتیش لە دژی ئەو کۆسپ و تەگەرە سەختانە خەباتی دەکرد.

پەیدابوونی بیرو هزری لیبرالییەت هاوکات بوو لەگەڵ سەرهەڵدانی پرنسیپی جیاکردنەوەی ئایین لە دەوڵەت و پرنسیپی سەروەریی ئەقڵ و ئازادیی تاک لە هەڵبژاردنی شێوەی ژیانی خۆی. ئەم لیبرالییەتە درێژ بووەوە تاکو لایەنی ئابووری ژیانی تاکیشی گرتەوە و لیبرالییەکان باشترین و بە هێزترین لایەنگیری ئازادی بازاڕ و بازرگانی بوون و لەو باوەڕەدابوون کە کۆمەڵگا دەتوانێ بگاتە باشترین شێوەی ژیان و گوزەران، ئەگەر رێگەی ئازادی تاک بدرێ بۆ کارکردن بەو چەشنەی کە خۆی دەیەوێ بەبێ ئەوەی دەستەڵاتی سیاسی حوکمڕان تێکەڵی کارەکانی بێت.

بزووتنەوەی لیبرالییەت لەسەر ئەم پرنسیپانەی خوارەوە رادەوەستێ:

١. دەستەڵاتی سیاسی حوکمڕان دەست لە کاروباری ئابووریی بازاڕ وەرنەدات و ئازادی تاک لە هەموو



روزفلت

بوارەکانی کۆمەڵایەتی و ڕووناکبیری و هەڵس و کەوتی ڕۆژانەی بپارێزێ.

٢. پرنسیپی دووەم کە گرنگترین کۆڵەگەکانی بزووتنەوەی لیبرالییەت پێکدێنێ پرنسیپی ڕەت کردنەوەی جەنگە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان و کارکردنە لە پێناو پاراستنی ئاسایشی جیهان، ئەم پرنسیپەش لە پاش بڕانەوەی جەنگی دووەمی جیهانی بە تەواوی سەلمێنرا کە لە ئەنجامی ئەو جەنگە پتر لە ٥٠ ملیۆن کەس لەناوچوون بێجگە لە بریندار و شێوێنراو.

لیبرالییەکان دەورێکی چاکیان هەبوو لە چەسپاندنی ئاسایش و ڕێگەگرتن لە ڕوودانەوەی جەنگێکی دیکەی ویرانکەری جیهانی، وەک بڵێی خەڵکیان بە هۆش هێنایەوە تاکو ئاسایشێکی بەردەوام بچەسپێنن و دامەزراندنی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان باشترین نموونە بوو بۆ ئەو هوشیار بوونەوەی خەڵکەکە و لە سەرووی هەمووشیانەوە لیبرالییەکان.

بەڵام کاتێک لە ساڵی ١٩٢٩ بەملاوە قەیرانێکی ئابووریی سەرتاسەری لەهەموو جیهاندا لە ئەنجامی زۆربوونی بەرهەمی کارگەکان و کزبوونی هێزی کڕینی ئەو بەرهەمە کەڵەکە بووانەدا، لیبرالییەکان بۆ ڕزگار بوونی جیهان لەو قەیرانە سەختە قایل بوون بە پەرەپێدانی پرنسیپەکانیان بە جۆرێکی کە لەگەڵ پرنسیپی (کینزی) کە زانا ئابووری بەریتانی ناسراو (جۆن کینز) دایهێنابوو ڕێک بکەوێ، بەوەی کە بە پێویست دەزانرێ دەوڵەت پشتگیریی چالاککردنی کڕین و فرۆشتنی کوتاڵی بازاڕ بکات تاکو توانای کڕیاریان بەرزکاتەوە، ئەمەش لەسەردەمی سەرۆکایەتی فرانکلین ڕۆزفلت (١٩٣٣- ١٩٤٥)ی سەرۆکی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکادا پەیڕەوکراو و تارادەیەکی باش ئەو کێشە گەورەیەی چارەسەر کرد.

لە ماوەی سی ساڵی دووای کۆتایی هاتنی جەنگی دووەمی جیهانی دا ڕەوتی لیبرالی یەکێک بوو لە ڕەوتە چالاکە سیاسییەکانی گۆڕەپانی جیهان و هەوڵ و کوششی بەردەوامی بۆ دابین کردنی کۆمەڵگایەکی خۆش گوزەران بوو و دەوڵەتان هاتنە سەر ئەو ڕایەی بیمی کۆمەڵایەتی بۆ بێکار و بێ نەوایان دابین بکەن و شوێنی حەوانەوەی بە ساڵاچووەکان و بێ نەوایان دابین بکەن و یاسا بکەنە سەروەر لە چارەسەرکردنی هەموو کێشەیەک و سەربەخۆیی دەستەڵاتی دادوەریی بپارێزن و تا ڕووە مرۆڤایەتیەکەی ئەو



جیمی کارتەر

**■ لیبرالییەکان دەورێکی چاکیان هەبوو لە چەسپاندنی ئاسایش و ڕێگەگرتن لە ڕوودانەوەی جەنگێکی دیکەی ویرانکەری جیهانی ■**



جورج بوش

**■ دوای نەمانی جەنگی سارد لە نێوانی رۆژهەڵات و رۆژئاوا و هەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤیەت، بزووتنەوەی لیبرالییەت بەرگێکی نوێی لەبەرکرد بە تایبەتی لەنێو دەوڵەتەکانی جیهانی سێیەم ■**

دەوڵەتانە گەیشتە باڵاترین پلە ئەویش نەهێشتنی حوکمی لە سێدارەدانە لە یاساکانیاندا.

دوای نەمانی جەنگی سارد لە نێوانی رۆژهەڵات و رۆژئاوا و هەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤییەت، بزووتنەوەی لیبرالییەت بەرگێکی نوێی لەبەرکرد بە تایبەتی لەنێو دەوڵەتەکانی جیهانی سێیەم و دەوڵە عەرەبییەکان. لیبرالییەتی نوێ جۆرە پرنسیپێکی تازەی بۆ خۆی دانا، ئەویش ئەوە بوو میللەتانی ئەو وڵاتانەی کەوتبوونە ژێر حوکمی رژێمی دکتاتۆری داپلۆسەر و ریگەی ئازادییان لێ گیرابوو و ئەو چەوساندنەوەیشیان ماوەیەکی دوور و درێژی خایاند تاوای لێهات ئەو میللەتانە و لە سەرووی هەمووشیانەوە لیبرالییە نوێیەکان لەو رژێمە داپلۆسەرەی حوکمڕانیان وەرس بن و بە دوای رزگارکەرێکدا بگەرێن یارمەتییان بدات بۆ گۆرینی رژێمی حوکمی داپلۆسەری فاشی بە سیستەمێکی دیموکراتی تاهەموو رۆڵەکانی ئەو میللەتانە بە ئازادی و یەکسانی و دادی کۆمەڵایەتی بگەن و بچنە پاڵ کاروانی سیستەمی دیموکراتیی جیهانی تازە کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا رابەریی دەکات بە تایبەتی لەسەردەمی سەرۆک (جیمی کارتەر) تا دەگاتە سەرۆک جۆرج دەبلیو بوش و لەو ماوەیەشدا یارمەتی گەلێک لە میللەتانی جیهان درا بۆ رزگاربوونیان لە رژێمی داپلۆسەریان ئەم لیبرالییە نوێیانەش لە وڵاتێکی وەکو عێراقدا، لەناو بردنی رژێمی دکتاتوری فاشی سەدامییان بە پشتگیریی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بە کارێکی راست زانی، چونکە ئامانجی ئەو گۆرانکارییە سیاسییە دامەزراندنی سیستەمێکی دیموکراتی ئازادە لە شوێنی ئەو رژێمە داپلۆسەرە، بە بێ گوێدانە پێشێل کردنی سەروەریی ئەم وڵاتە.

لیبرالییە نوێیەکان لە مەیدانی ئابووری مەسەلەی گەڕانەوە بۆ پرنسیپی ئازادی رەها لە بازاڕ و بازرگانی نوێدا و، پرنسیپی دادی کۆمەڵایەتی و دەست تێوەردانی دەوڵەت لە کاروباری دابەشکردنی سامان، بوونە پرنسیپی کۆن و لەکار کەوتوو. لەهەمان کاتیشدا لە پێناو بنیادنانی کۆمەڵگای شارستانی نوێ و دابین کردنی ئازادی تاک، داگیرکاری بیانی و شکاندنی سەروەریی وڵات هیچ تەگەرەیەک دروست ناکەن لە رێی گەیشتنە ئەو ئامانجەی کۆمەڵگای تازەدا. ■

# چۆنیەتی فێربوونی نووستن!



و/لە سویدیەوە:
ئاواز مستەفا مەحموود

منداڵ لەناو سکی دایکیدا هەڵس و کەوتی ڕۆژانەی زۆر جیاوازە لەگەڵ ئەوەی کاتێک لە دایک دەبێت، پاش ئەو نۆ مانگەی ناو سکی ئافرەتدا منداڵ پێویستییەکی بێ سنووری بە کات هەیە بۆ ئەوەی خۆی لەگەڵ دەوروبەری دەرەوەدا بگونجێنێت ئەمەش هەرگیز لە هیکرایەک پێک نایەت.

تێگەیشتنی پرسیاری، بۆچی منداڵ دەخەوێت؟ هەروەها بۆچی هەندێک جاران ناخەون؟ کلیلە بۆ دۆزینەوەی وەڵامی: چەند بڕ گونجاوە بۆ نووستنی منداڵ؟ ئەمەش خۆی لە خۆیەوە هەنگاوێکە کە دەبێت باوک و دایک و منداڵەکە پێکەوە بەشداری وەڵامەکە بکەن، لە سەرەتادا کات و پشوویەکی باشی دەوێت، بەڵام لەدواییدا بە دڵنیاییەوە هەموو شتێک پێکدێت.

نووستن، تەنها بۆ گەشەکردنی منداڵەکە پێویست نییە بەڵکو، بۆ ئەوەش باشە کە هەموو ئەندامانیماڵەوە دەتوانن

منداڵێکی تازە لەدایکبوو وەخت بەسەربردنی شەوو ڕۆژی جیاوازە لەگەڵ هی یەکێکی پێگەیشتوو.

لەکاتی نووستنی منالەکە پشویەکی باش بدەن، بۆ ئەوەی کاتێک کە منالەکە بە ئاگادێتەوە جارێکی تر بتوانن بایەخێکی باشی پێبدەن و کاتێکی خۆش بەیەکەوە بەسەربەرن.

**بۆچی نووستن ئەوەندە پێویستە؟!**

منالّ لە رۆژدا بەرەنگاری زۆر تەگەرە دەبێتەوە، لە کاتێکدا گەورە دەتوانێت خۆی لە زۆر شتدا دوور بخاتەوە کە حەزی لێناکات، منالّ هەموو شتێک دەبینێت و گوێیان لە هەموو شتێکە، لە کاتی نووستندا کاتێک کە جیهان کش و ماتە لەشی ئادەمیزاد دەتوانێت وزە کۆ بکاتەوە چارەسەری کەمو کوڕی لەشی و نەخۆشیەکانی بکات هەروەها منالّ لەگەلّ ئەم شتانەی گوێی لێبووە و دیتوویەتی بتاوێتەوە و جیایان بکاتەوە.

کاتێک کە ئادەمیزاد دەنوێت لەشەکەی گرنگی بەوە دەدات کەوا گەشە بە مێشک و هەستەکانی بدات زۆر جاران تۆ منالەکەت دەبینێت کە چۆن لە کاتی نووستنیدا خۆی گرژ دەکاتەوە و لە دەمو چاوی دیارە کە ئەو شتانە دووبارە دەکاتەوە کە لە کاتی ئاگاییدا بیستوویەتی، ئەم شتە دیاردەیەکی خۆنەویستە و سروشتییە کە تێیدا هەمدیس شتیش فێردەبێت.

منالّ بۆ گەشەکردن نووستنی پێویستە، ئەمە شتێکی سەیر دیارە، بەلاّم زانایەکان بەوە گەیشتوون کە هۆرمۆنی گەشەکردن لەکاتی نووستندا رێژەی زۆر بەرز دەبێتەوە، هەروەها کاتی نووستن کاتێکی زۆر بە نرخە بۆ ئەوەی منالەکە پەرە بە ماسوولکە گەشەنەکردووەکانی بدات کاتێک کە منالەکە لە ئیسراحەت دایە ناخولێتەوە و ئەندامەکانی لەشی کارناکەن، بۆیە لەشی دەتوانێت لەبری جوولەی نوێ تاقی بکاتەوە بێ ئەوەی کە پێویست بکات وزە و ماندووبوون بەکاربهێنێت بۆ نموونە وەک راگرتنی لەنگەر.

**منالەکەت چەند بخەوێ باشە؟!**

منالّی ساوا تێکڕا هەمیشە دەنوون بێئەوەی کاتی نووستنیان زۆر دیاربێت، بەلکو پەرش کراوەتەوە سەر شەو و رۆژ ٣/٢ ی رۆژ لە خەودان، ماوەی شەش مانگ دەخایەنێت



تاوەکو منالّ کاتی نووستنی بەهی یەکێکی گەورە دەچێت، تێکرا نیوەی شەو و ڕۆژێک دەخەون لە ڕۆژدا درێژترین ماوەی خەویان شەش سەعاتە، خەوی شەوانەیان زیاتر دەبێت، منالّ لە تەمەنی یەک سالّیدا لە ڕۆژدا لە دوو سەعات زیاتری خەو پێویست نییە.

**دوو جۆر نووستن هەیە!**

کاتێک کە دەخەوین بە دووجۆری خەودا تێدەپەڕین، جۆرێکیان پێی دەڵێن قووڵ و ئەوی تریشیان سووک، گەورە و بچووک بەم دوو جۆرە وەکو ئەڵقەیەک ئاڵوگۆڕ دەبێتەوە.

هەرکەسێک کە خۆی لە خەوێکی قووڵدا دەبینێتەوە، یەکسەر بە ئاگا نایەتەوە، بۆیە دەتوانین مۆسیقا لێبدەین تەنانەت گێسکی کارەباییش لێبدەین بێ ئەوەی منالّەکەت لەکاتی تێپەڕینی بەم جۆرە خەوەدا هەڵبسێتەوە.

کاتی خەوی ناقووڵ کە پێشی دەوترێ خەوی سەرپێیی یان خەوی سووک، منالّ یان هەر کەسێک تەنانەت بە چرپەیەکیش هەڵدەستێتەوە، منالّی بچووک دوو ئەوەندەی گەورە بەم جۆرە خەوەدا تێدەپەڕێ!

کاتی خالّی گۆڕینی جۆری خەو لە نێوان خەوی قووڵ و خەوی سووک، کاتێکی لە رادە بەدەر ناسکە بۆ منال، لەو کاتەدا زۆر هەستیارن بۆ خەبەربوونەوە، بە پێچەوانەی کەسێکی گەورە کە باشتر دەتوانێت مامەڵەی لەگەڵ بکات و جارێکی تر بخەوێتەوە.

**ئایا چی بکەین ئەگەر منالّ لە خەو هەڵساوە؟**

* ژووری نووستنی منالّ لە ژوورەکانی تر جیا بکەوە، واتا ژوورێکی تایبەت بۆ منالّەکەت دابنێ بۆ خەوتن، لەم کاتەدا هەست بە ئاسوودەیی دەکات و دەتوانێت هەر بە خۆی لە خۆیەوە بخەوێت. کاتێکی دیاری کراو بۆ خەوتنی منالّەکەت دابنێ، ڕۆتینێک دابنێ بۆ نووستنی منالّەکەت.

* ئەوەی ڕوون و ئاشکرایە کە لە خەو کردنی منالّێک لە خەواندنی ئاسانترە لە هەمان کاتدا منالّێکی برسی. یان منالّێکی تەنیا یاخود مشەووەشێک ناتوانێت بنوێت هەرچەندە کە زۆر خەویشی بێت.

**کەی دەست بە دانانی ڕۆتین بۆ خەواندنی منالّێک بکەین؟**

کاتێک کە منالّەکەت دەگاتە تەمەنی (٣) مانگی، کاتی ئەوە دادێت کە ڕۆتین بۆ منالّەکەت دابنێیت، هەر منالّێکیش جیاوازە لەگەڵ منالّێکی تر، بۆیە لەوانەیە شتێک بۆ منالّێک گونجاو بێت و بۆ یەکێکی تر باش نەبێت، شێلان (massage) دەبێتە هۆی خاوبوونەوەی منالّ، خاوبوونەوەش دەبێتە خەولێکەوتنیان، یاخود سەرشتنی منالّ دیسانەوە زۆر کاریگەری هەیە بۆ خاووبوونەوەی، بۆیە وا چاکە کە هێواران منالّەکەت بشۆیت و گەرم داپۆشیت و شێلانی بە شێوەی جوولەی بازنەیی بچووک بۆ بکەیت.

وابکە لەماڵەوە هێدی قسەبکەن لەبەر خاتری منالّەکەت، بەلاّم لە هەمان کاتدا بێدەنگییەکی یەکجار کش و ماتیش نییە!

منالّی بچووک پێویستە کە خۆی ڕابێنێ لەو دەنگە ئاساییانەی کە ڕۆژانە لە ناو ماڵدا ڕوودەدات، بۆیە پێویست ناکات ئێوە لە گفتوگۆ و ئاخاوتنی خۆتان بکەون لە کاتی نووستنی منالّەکانتان، بەلاّم لە بری ئەوە دەتوانن دەنگی بەرز کەم بکەنەوە، مۆسیقای بەرز بکوژێننەوە و تۆزێک نزمتر قسەبکەن بۆ ئەوەی یارمەتی منالّەکەتان بدەن بۆ خەوتن.

**تەختێکی دیارکراو بۆ منالّەکەت!**

کە منالّەکەت لە جێگای دیاریکراوی خۆی دانا، واتا لەسەر تەختی خۆی وا باشە جلێکی خۆتی لە تەنیشتەوە دابنێیت، بۆ ئەوەی کە

بەخەبەر هات بۆنی جلکی تۆ بکات کە بەمە دڵنیـایی دەخـەیتـە دڵی منالەکـەتەوە، لە ئەنجامدا دەتوانێت جارێکی تر بخەوێتەوە.

**یەکسەر منالەکەت**

**لەناو تەختی خۆی دابنێ**

پێویست ناکـات منالّ لە باوەشی خـۆتەوە دابنێیت تا بخـەوێت، بەلکو یەکسـەر لە ناو تەختی خۆی دابنێ، چونکە ئەگەر لە باوەشی خۆتدا خەواندت، ئەوا لەکاتی هەڵسـانەوەی خـۆی لە جـێگایەکی تردا(ناو تەختـەکـەوە) هەست بە نـائارامی دەکــات و نـاتوانـێت جارێکی تر بخەوێتەوە.

**ڕێگایەکی وا بۆ منالەکەت بیینەوە**

**کە بۆ تۆش شیاو بێت**

کاتێک بیر لە دانانی ڕۆتین (شـێواز)ێک بۆ خەواندنی منالەکەت دەکەیتەوە، پێویستە ڕەچاوی ئەوە بکەیت کە ئەم شێوازە بۆ ماوەی چەندین مـانگ دەمـێنێتـەوە، منالّ هەژاندن و لاواندنەوە یاخود ڕاکـشـان لەلای منالەکـەتدا لەکـاتی خـەوتنیـدا لەوانەیە کـاتێک کـە منالەکـەت سـاوایە بگونجـێت، بەلام کـە منالەکـەت گـەورەتر دەبێت لەوانەیە هەمـوو جـارێک مـاوەت نەبێت و بۆت نەلوێت ئەم شێوازە بۆ منالەکەت تەرخان بکەیت بۆ ئەوەی بخەوێت.

**زانیاری دەربارەی خەواندنی**

**منالانی نیو ساڵە**

کـاتێک منالەکـەت گـەورەتر دەبێت، جوولەشی زۆرتر دەبێت بە ڕۆژ زۆر بەئاگایە و دەجـوولێـتـەوە، هەتا ئەگـەر ئێـسـتـاش نە کەوتبێتە گاگۆڵە کردن، بەلام جوولەی زۆرە.

**خۆت بە هەمان ڕۆتینی خەو ببەستێتەوە:**

وا باشـە کـە خـۆت بە هەمـان جـۆری خەواندنی منالەکەت ببەستێتەوە کە منالەکەت هەیبوو لە کاتێکدا کە ساوا بوو، چونکە ئەگەر منالەکـەت بە ڕۆتینی خـۆی ئاشنا بوو، ئەوا سـوودی بۆ ئەوەش هەیە کـە کـاتێک سـەفەر دەکەیت بە ئاسانی منالەکەی خۆت بخەوێنیت، یاخـود خـوا نەکـات کـاتێک کـە نەخـۆش دەکەوێت.

**خشتەی خەوو خواردنی منالەکەت**

**بنووسەوە**

ئاسانە کەوا وەختی خەواندنی منالەکەت چارەگـێک بچـێتـە پێش و پاش ئەم کـارە بۆ ڕۆژێک هیچ ناکات، بەلام ئەگەر بێتو بەردەوام ئەم دیاردەیە دووبارە بۆوە وەختـەکە زۆر گۆڕا



ئەوا لە منالەکە تێک دەچێت، بۆیە خشتەیەک دابنێ بۆ خەوو وخواردنی منالەکەت.

### مەرج نییە گریانی منالّ نیشانەی خەمباری بێت

ئاشکرایە کە کاتێک منالێک دەگرییێت، دایک و باوک زۆر پەشۆکاو و دلّتەنگ دەبن، بەلاّم دەتوانم بلێیم کە زۆر جاران منالەکە ئەوەندە ئازار ناکێشێ ئەوەندەی کە دایک و باوک دەکێشن، گریان و هاوار کردن رێگەیەکە کە منالّ گفتوگۆ و پەیوەندی بە دەوروبەری بکات، پێویست ناکات هەموو جاران نیشانەی ئەوە بێت کە منالەکە ئازار دەخوات و تەندروستی خراپە، بەلاّم هەندێک جاران وا رێک دەکەوێت کە منالەکە چەند ئێوارەیەک لەسەر یەک دەگرییێت ئەویش لەوانەیە کە تۆ شتێکت لە منالەکەت گۆڕیوە کە حەزی لێناکات وەکو لێکردنەوەی لە مەمەی لاستیک.

### زانیاری دەربارەی خەواندنی منالّی یەک سالّە

ئێستاکە منالەکەت بە رێکوپێکی کەوتۆتە جوولانەوە و چالاکی، گاگۆلە دەکات و دەڕوات، ئەوەی کە لەسەرە تۆیە، ئەوەیە رەچاوی ئەوە بکەیت کە دەبێت نرخێک بۆ رۆتینی (شێوازی) نووستنی دابنێیت، منالەکە پێویستی بەوە هەیە کە ئیسراحەت بکات و بخەوێت، ئەگەر منالەکەت هەوای پاک هەلّمژێت، بۆی ئاسانتر دەبێت بخەوێت، بۆیە منالەکەت بخەرە عارەبانەیەکەوە و بەیەکەوە پیاسەیەکی دوورو درێژ بکەن.

دەتوانێ هەندێک کردەوە بۆ منالەکەت دابنێیت وەکو نیشانەیەک بۆ هاتنی کاتی نووستن، بۆ نموونە منالەکەت بشۆیت و بینوێنیت یاخود هەندێ ئاوی بدەیتێ بەر لە نووستنی یاخود چیرۆکێکی شەوباشی بۆ بخوێنیتەوە یاخود لە هەموو ئەندامەکانی خێزان ماچێکی شەوباش وەربگرێت.

### خۆت بە کاری دیارکراوی منالەکەت ببەستەوە

منالەکەت بە لایەنی کەمەوە رۆژێ جارێک پێویستی بە نووستن هەیە، باشترە کە لە هەمان کاتدا بێت.

### برادەرێک بۆ منالەکەت

لە کاتی نووستندا ئاژەلێکی بێگیانی نەرم لەناو تەختیدا دابنێ، ئەمە بۆ منالەکەت تەنیا ئەوە نییە کە خۆشە، بەلکو وەکو ئارام کەرەوەیەکە بۆ منالەکەت کاتێک کە بە نیوەشەو بە ئاگادێت.

### کەس ناتوانێت بە راوەستان بخەوێت

کاتێک کە منالەکەت لە ناو جێگاکەیدا دادەنێیت ئاگاداری ئەوە بکە کە پالّ کەوتووە و درێژ بووە، چونکە هیچ کەسێک ناتوانێت بە راوەستان بخەوێت، بۆیە وا باشە کە جار بەجار سەیرێکی بکەیت بۆ ئەوەی کە هەلّساوە درێژی بکەیتەوە تاوەکو دەخەوێت.

### هەندێک یاری بۆ منالەکەت لە دەورو بەریدا دابنێ

لەکاتێ روژهەلاّتدا کاتێ کە منالەکەت لەخەو هەلّدەستێتەوە، لەوانەیە ئێوە بتانەوێ تۆزێکی تر بخەون، بۆیە وا باشە کە هەندێک یاری نەرم و نۆلّ لە نزیک منالەکەت دابنێیت بۆ ئەوەی لە کاتی بەیانیان زوو یاری پێبکات.


سەرچاوە:

ProfessorAnette Karmmillof och - smith Kyra Karmillof, magister I pskologi fran University College i London (frfatteare till boken... sleep-how to understand and support a good night, sleep for your baby).
Smat exporter fran Pampers Institutet.

# بزووتنەوەی هونەری لە شاری ڕەواندز



**ئا.مێرگ**

شاری دێرینی ڕەواندز، پایتەختی پاشای گەورەی دوێنێ و شاری زیندوو و هۆشیاری ئەمڕۆ، لە سەرەتای حەفتاکانی سەدەی ڕابوردووەوە، بزووتنەوەیەکی ڕێکوپێکی هونەری بەخۆوە دیوە، بە تایبەتی هونەری مۆسیقاو ئاوازی ڕەسەنی کوردی.

بێگومان ئەم بزووتنەوەیە دەگەڕێتەوە بۆ ئەرک و ماندووبوونی مامۆستا پێشەنگەکانی قوتابخانەکانی ئەم شارە و مامۆستای دڵسۆزی کورد (زرار)ی مۆسیقازان. ئەو خزمەتگوزارە توانی لەو سەردەمەوە دەستەیەکی باش لە قوتابیان لەسەر ژەنینی ئامێری هەمەجۆری مۆسیقای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایی ڕابهێنێ و وا پتر لە سی ساڵە ئەم ئەرکە هونەرییە نیشتمانییەی گرتۆتە ئەستۆ ، هەرچەندە ئەمڕۆکە سەری وەکو لوتکەی چیا سەرگەشەکانی کوردستان سپی بووە، بەڵام بە دڵ و هەست و بیری هونەریی و کوردایەتی هەرگەنجە و داوای سەرکەوتن و تەمەن درێژی بۆ دەکەین. چونکە تاکو ئەمڕۆکەش دوو کۆمەڵ لە منداڵە چاو گەشەکانی شارە خۆشەویستەکەی پەروەردە دەکات و لەسەر ئامێری مۆسیقایان ڕادێنێ، بەو هیوایەی مۆسیقازانی دیکەی وەکو



هونەرمەند چەتۆ نەورۆز پێبگەیەنێ

مامۆستا زرار لە چاوپێکەوتنێکی دا لەگەڵ پەیامنێری گۆڤارەکەماندا، گلەیەکی زۆری لە بارەی ئەمڕۆی مۆسیقاو ئاوازی کوردی هەیە و دەیگوت: مۆسیقاکەمان کاریگەریی مۆسیقای فارسی و عەرەبی و تورکی و ڕۆژئاوایی پێوەدیارە و پێویستە ئاوازی مۆسیقای کوردی ڕەسەنایەتی خۆی وەدەست بێنێتەوە،پێویستە زۆر بنکەی ڕۆشنبیریی هونەری لەو شارە مێژووییەی کوردستان بکەرێنەوە، تاکو نەوەیەکی نوێ لە ڕۆڵەی کورد لەسەر زانستی نوێ و ئەدەب و هونەری ڕەسەنی نەتەوەیی خۆی را بهێنێ، بۆ دروستکردنی کۆمەڵگەیەکی نوێی هوشیار لەم سەردەمەماندا تاکو بەسەرفرازی و ئاسوودەیی لە ڕیزی کۆمەڵگەی جیهانی پێشکەوتوودا بژی.

*

# داره بزماره

عەبدولرەقیب یووسف

پێویستە نووسەر و رۆشنبیرانی کورد لەسەر هەموو جۆرە داب و نەریتی کوردەواری بنووسن، بێ ئەوەی لێکی بدەنەوە، راستە یان پڕوپووچە، چونکە عەقڵییەت و بیرو باوەڕی خەڵکی کورد تێیاندا دەردەکەوێ، کوردیش وەک هەموو میللەتان لە قۆناغێکی ژیاندا بڕوای بە زۆرشت هەبووە تا بە هەندێ بەرد و درەختیش تەنانەت لە کورد لە هەندێ شوێندا چنار و زەیتوونی پەرستووە وەک باسم کردووە لە هەندێ لە نووسینەکانی خۆمدا، بەڵام ئەم زانیبوو دارە بزمارەش هەیە کە لە هەندێ شوێن کوردەکان بۆ چارەسەرکردنی هەندێ جۆری نەخۆشی پەنایان بردووەتە بەر درەختێک و بزماریان لێداوە تا نەخۆشییان بڕوا و چاک ببنەوە،



تا ئەم شێوە نایابەشم دیت کە دیارە زۆر کەمە لە کوردستان، دەنا بێ گومان دەبا من دیتبام لە گەڕانە فراوەنەکەمدا لە پێناو شوێنەوارو کەلەپووری جۆراو جۆری کورد لە شاری مەندەلییەوە بگرە تا ڕۆژهەلاتی دیاربەکر و موش و وان و ناوچەکانی ئورمیە و مەهاباد و سەقز و سنە کە تا ئێستا توانیومە بیست و دوو هەزار (٢٢٠٠٠)وێنەی فۆتۆگرافی جگە لە وێنە بە کامیرای ڤیدیۆ لەم بوارانە دا بگرم.

ڕۆژی ٢٠/٤/٢٠٠٥ کە لە هاوینە هەواری سلاحەددین دەهاتم بۆ هەولێر، لە ڕێگادا لەلای دەست پێکردنی زنجیرەی (چیای پیرمام)دەست پێ کردنی باکووری ڕۆژئاواکەی، کاتێ گەیشتمە دێیەک لەسەر ڕێگای گشتی شوفێرە کە بەمنی وت ئەمە دارە بزمارەیە. پرسیم دارە بزمارە چییە؟ وتی ئەوانەی نەخۆشبن دێن و هەریەکە بزمارێک لەم دار بەڕووە دەدات تا نەخۆشیەکەی بڕوات، منیش کە لە شتێکی وەها دەگەڕێم یەکسەر لە ئوتومبیلەکەم دابەزیم، دیتم بەهەزاران بزمار تا پارچە ئاسن و نالە هەسپ و قەوانە فیشەک و سەرە سیفۆن و شتی دیکەش لە قەدی دار بەڕووێک دراوە کە دەوری قەدەکەش (٤،٣٠م)ە و گەورەترین درەختە لەنێو قەبرستانێکی مەیلە و بچووکدایە و (دارە شەخس)ە لەولاتری بە دوو مەتر قەبرێک هەیە لەنێو کەلەکە بەردێکدا لە دوو ڕیز بەرد پێک هاتووە و دبێژن گۆڕی صەحابەیە، کێلەکەی بەردێکی بچووکە ئەگەر چی باوەڕیشم بەو قسەیە نیە، بەلام هەر وێنەیم گرت.

لایەک لە قەدی دارە بزمارەی وشک و کلۆربووە کە لەسەر پەرشتیارەکەیم پرسی یان بێژین مجێورەکەی کە لاوێک بوو ناوی (زرار سیسە نعمەت)وتی دێیەکەمان لە کاتی شۆڕشدا سێ جار هاتووەتە سووتاندن لەلایەن عەسکەری صەدامەوە تا ئاگریشیان بەردایە دارەبزمارەکەشی و ئەو لایەی سووتا، کاک زرار وتی دارەکە زۆر کۆنە وهی کاتی باب و باپیرانیشمان نییە، خەلکی لەم گوندانەو تا دیانە و موصلیش بۆ نەخۆشی ژانە سەر و ژانە ددان و بالووکە دێن بۆ سەر ئەم دارە و هەریەک دەبێ بزمارێک لەقەدی بدات تا نەخۆشیەکەی چاک بێتەوەو چاکیش دەبن.ئەم بڕواو عادەتە لە کۆنەوە هەیە تا دێیەکەشمان بەناوی ئەوەوە ناو نراوە و ناوی بووەتە (گوندی دارەبزمارە) دێی ئێمەی کۆچەری هەرکییە وەک دێیەکانی (دێرە)کە بە ٢کم لە باشووریەتی ودێی سەرۆکانی و هەردوو شێخان و دوو بەربیا و قەفەر و میران خوڕ و





درەش و هەرشەم.

سندوقێکی بچووکیش بە بزمار لەقەد ئەم دار بەڕووەیە قەیم کرابوو، کە پرسیم لە زرار ئەمە چییە؟ وتی ئەمە سندوقی خێراتە خەڵک پارە دەخەنە ناوی و نیازمانە بەو پارەیە دەوروبەری دارەبزمارە تەلبەند بکەین، تا ئاژەڵ نەچنە ناوی ئیتر منیش هەندێ پارەم خستە نێو سندوقی خێرات. هەر لەوێ بووم محەمەد ئیسماعیل خەڵکی رانیە و محەمەد عەبدوڵلای خەڵکی چوار قوڕنە هاتن و یەکەو بزمارێکیان لەم درەختە بەد بەختەدا کەڵیم پرسی وتی ددانم ژان دەکات. وەها دارەبزمارە بووەتە گەنجینەیەک بۆ شێوەکانی بزمار لەماوەی دەوری سێ سەد ساڵ یان پتر، هەر کەسێک بیەوێ لێکۆڵینەوەیەک بکا لە بارەی جۆری بزمار کە رەنگە ئێستا هەندێ جۆریشی لە کوردستان نەمابێ، ئەوا بێتە دارە بزمارە، شایەنی باسە لەم دووسێ هەفتەی رابوردوودا کە باسی دارەبزمارەم کرد بۆ برای بەرێز مامۆستا تەحسین شێروانی کە ئێستا لەبارەی عەشیرەتی شێروانییەوە کتێبێک دادەنێ و هەندێک لە کەلەپووری دەشتی هەولێر و مەخمووری کۆکردووەتەوە وتی لەلای مەخمووریش دارە بزمارە هەیە و داوام لێ کرد بچێ وێنەی بگرێ و ووتارێک لەبارەوەی بڵاو بکاتەوە.

هەرکییە کۆچەرەکانی دارەبزمارە کۆمەڵە زنجێکی زۆر جوان و سەرنج راکێشیان دروست کردووە بۆ ئاژەڵەکانیان کە دێیەکەیان بیست ماڵە، هەروەها هەرکییەکانی دێهاتەکانی دیکەشیان کە لە گوندی (دێرە) کە رژێمی سەدام قەڵا جوانەکەی وێران کردووە لە ٣/٥/٢٠٠٢دا

وێنەی هەندێکیانیم بە فۆتۆگراف و ڤیدیۆ گرتووە و زۆر بە وردی زانیاریم نووسی لەبارەی هونەری ئاوەدان کردنەوەیان، چونکە زنج کە هەرکی لە دروست کردنیاندا بالآدەستن، شێوەیەکی کۆنە لە شێوەکانی خانوبەرە لە کوردستان.

**لە کۆتاییدا داواکارم:**

١- خەڵک بزماری درێژ و پارچە ئاسن و ناڵی هەسپ و شتی وا گەورە لە دارەبزمارە نەدەن، تا باری زۆر قورس نەبێ و زەرەر لە توێکڵی قەدەکەی نەدات و وشک نەبێ.

٢- داوا لە بەڕێوەبەرایەتی دائیرەی شوێنەواری هەولێر دەکەم بەرەسمی دارەبزمارە بکات بە درەختێکی شوێنەواری وەک لە هەندێ وڵات ئەمە کراوە و سیفەتی گەشتوگوزاریشی هەیە.

٣- داوا لە بەڕێوەبەرایەتی کشتوکاڵی هەولێر دەکەم لێژنەیەک لە ئەندازیارەکانی بنێرێ بۆ لێکۆڵینەوەی وەزعی ژیانی دارەبزمارە و چی پێویستە بکرێت تا تەمەنی زۆر درێژ ببێت و هەرکاتی خوا نەخواستە وشکیش بوو، ئەوا پێویستە قەدە پڕ بزمارەکەی بۆ مۆزەخانەی هەولێر بچێت و پێناسێن لە سەری بنووسرێ کە دزانی شوێنەواریش زەفەری پێ نابەن.

٤- هەندێ درەختی دیکەش لە کوردستان هەیە، پێویستە بپارێزرێن لەلای دائیرەکانی شوێنەوار و کشتوکاڵەوە وەک (گوێزی مار یوحەنا) لە گوندی (دفری)لە ناوچەی ئاکرێ کە تەمەنی بەرەو هەزارو چوارسەد ساڵ دەچێ و (چنارە سوورە)ی شاری چوارتا کە زۆر سوپاسم هەیە بۆ قایمقامیەت و شارەوانی چوارتا کە دەورەکەی تەلبەند کردووە و دەور مادەوری قەدەکەی پازدە مەترە و چنارم لەوە گەورەتر نەدیوە لە کوردستانی باشوور

سەربازانی ڕژێمی سەدام نەک هەر دێهاتەکانی کوردستانیان سووتاندووە وویرانیان کردووە، بەڵکو زۆرشتی نایابیشیان لەنێو بردووە تا چنارە سوورەی چوارتاش نەوتیان پێدا کردو سووتاندیان، بەڵام چنارەکە هەر خۆی گرت و ئێستا وەک ئەشکەوتێکی بچووک بەو سووتاندنەوەی لە قەدەکەیدا دروست بووە وەک لە وتارەکەمدا (دووچناری گەورە) باسم کردووە کە لە ڕۆژنامەی (میدیا)ژمارە(٩٣) بەرواری (٢٠٠١/٥/١)دا بڵاوبووەتەوە.

هەردوو چنارە گەورە حەوشی دیوانخانەی میرانی قادر بەگ لە شەقڵاوە کە قەدیان نزیک دە مەتر ئەستوورە، پێویستە بپارێزرێن، چونکە چنارەکانی دیوانخانەی هاوینانی میر سلێمانی برای خانزادی سۆران بوون لەسەدەی شازدەیەمدا وەک لەو وتارەمدا باسم کردووە و وێنەشیانم هێناوە

(داری زەرد)لە دێی جافەرانی قەرەداغ کە ئێستاش بەرێگای قۆپی قەرەداغ - سەنگاو دەشلێن (رێگای داری زەرد) لە رێگای گشتی کارواندا بووە دیاردەیەکی جوان چونکە پەلکەکانی ئەو دار بەڕووە زەردە کە لە (١٩٩٤/٩/٢٤)وێنەیم گرتووە، هەروەها داری زەرد سیفەتێکی مێژوویی و جوغرافی وەرگرتووە.

پێویستە هەر درەختێک خاوەن تایبەتمەندییەکی سروشتی، یان مێژووی،یان جوغرافی، یان دینی هەبێ لە کوردستان لە دائیرەکانی کشتوکاڵ و گەشتوگوزار و ژینگە و شوێنەوارەکاندا ناوی تۆمار بکرێت و بپارێزرێت.

# خەیاڵی/عەقڵانی سروش و پۆست مۆدێرنیتە

## (خوێندنەوەیەک بۆ فیکری ئەرگۆن لە کتێبی عەلمانیەت و ئایین)

عەبدولموتەلیب عەبدوللا

"کاتێ دیکارت سەری هەڵدا فەلسەفە سەربەخۆیی بەدەست هێنا، یان لە ژێر چنگی عەقڵی تیۆلۆژی رزگاری بوو، کەچی سەروەری عەقڵ زۆر بەتوندی بنجی بەست، پێشتر عەقڵی تیۆلۆژی -لاهوتی دانی بە زەلیلی عەقڵ، یان خاکەڕایی عەقڵ لە بەرامبەر پێدراوی سروش و لەراستیدا عەقڵ لەبەردەم سروشتدا دەچەمییەوە، بەڵام عەقڵی دیکارتی کە زۆر شانازی پێوە دەکەین سەروەری خود جێگیر دەکات" (١)

نموونەی ئەو پەرەگرافە لە کتێبی (عەلمانیەت و ئایین)ی (ئەرگۆن) وەرگیراوە، کە (نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد) کردوویە بە کوردی، ئەگەر چی نموونەیەکی بێ هاوتا و دەگمەن نییە، یان بیر کردنەوەیەک نییە جگە لە (ئەرگۆن) کەسی دیکە قسەی لە بارەوە نەکردبێ، بەڵام بە تەئکید لە کۆی ماناکانی ئەو پەرەگرافە، یان لە پشت ماناکانی چەمکی (سروش)(عەقڵ)(خود)(سەروەری) دوا جار ئاگا بوونی ئەرکۆن لە فیکرو فەلسەفەی سەردەم و هەروەها بەدوا داچوونەکانی ئەو بەرجەستە دەبێ.

ئەگەر چی مەسەلەکە هەرتەنها بەدوا داچوونی پێدراوی سروشتی و سەروەری خودی لە خۆدا هەڵنەگرتووە، بەڵام وەک دیارە لەو کتێبەدا (ئەرگۆن) دەیەوێ لە میانی مێژووی گەشەی فیکری قسە لە هەژموونی (سروش) وهەژموونی (عەقڵی) بکات، هەرلەوێشەوە لە ئاسمانەوە بەرەو زەوی دادەبەزێ، وەک چۆن هەوڵ دەدا بەشێوەیەکی بەرفراوان پەردە لەسەر ئەو



ئەرگۆن



هۆسرەل

■ فەلسەفەی (هۆسرەل) پرۆژەیەکی رەخنە ئامێزو هەڵوەشانەوەگەرایە، بەردەوام رەخنە لە سیستەمی ئاگایی و فەلسەفەی ئامادەگی دەگرێ ■

رەخنانە هەڵبداتەوە کە مێژووی گەشەی فیکری پلە بە پلە بڕیوبەتی تا دەگاتە ئەوەی ئەرزشی خەیاڵ و خەیاڵدان لە نێوان (سروش/ئاسمان) و (عەقڵ/زانست) دیاری بکات، هەر لەوێشەوە رەخنە لە عەقڵی زانستی دەگرێ، دەست بەسەر داگرتنی حەقیقەت لەلایەن ئەو عەقڵەوە دەداتە بەر توێژینەوە و بە دواداچوون، بەم جۆرە ئەو دێ لەبەرامبەر عەقڵی زانستی بەرگری لە حەقیقەتگەلێکی جیاواز دەکات، لەوێشەوە دووبارە شوێنی خەیاڵمان لە میانی فیکرو مەعریفە و ئیبداعدا بیر دەخاتەوە.

ئێمە لەو وتارەدا هەوڵدەدەین بە دوای بەشێکی دیاریکراوی ئەو دەرئەنجامانەدا بڕۆین و لەوێوە کەمەکێک قسە لە بەنێویەکدا چوونی بەردوامی خەیاڵی و عەقلانی دەکەین، هەروەک هەوڵدەدەین (جێکەوت)ەی هەردوو چەمکی (بەردەوامییەت) و (داپچڕان) بە مانا (دریدا) ییەکەی بخەینە ڕوو.

لە پاش "گۆرگیاسی"(٣) گومانکار، فەیلەسوفی فەرەنسی "دیکارت"(٤) بە دوای هەمان لێوردبوونەوەی گۆرگیاس کەوت، گۆرگیاسی سۆفستایی، گومانەکانی خۆی لە سێ مەسەلەدا کورت دەکاتەوە، یەکەمیان ئەوەیە کەلێرەدا هیچ شتێ بوونی نییە، دووەم ئەگەر شتێ بوونی هەبێ، ئەوە ئێمە ناتوانین بیناسێنین، سێیەم ئەگەر گریمان شتێ بوونی هەیە و دەتوانین بیناسێنین، بەڵام ناتوانین ئەو شتە بۆ ئەویدیکە بگوازینەوە.

لێرەدا گۆرگیاس هەموو شتەکان وەک دەسخەڕۆکردن و سەراب دەبینێ، بەومانایەش بەهیچ شێوەیەک ناتوانین قسە لە ئەسڵ وساختە، راست وچەوت بکەین، وەک دیارە لە پشت ئەو گومانانەی کە لە عەقڵ و هەست دەکرێ پرسیاری یەقین بەرجەستە دەبێ، (دیکارت) دێ ئەو شتەی کە بە یەقین ناوزەدمان کرد لە (خود)دا هەڵیدەگێرتەوە، هەر لەم بارەیەشەوە (دیکارت) دەڵێ لەکاتی دەسخەڕۆ کردنیشدا هەر دەبێ (من) بوونی هەبێ بۆ ئەوەی بیر بکاتەوە، هەروەها ئەو پێیوایە کە گومان و هەڵخەڵەتاندنیش بۆ خۆمان بیرکردنەوەن، بۆیە هەر دەبێ مرۆڤ بوونی هەبێ، لەوێشەوە لە میانی گوتەزاکەی (من بیردەکەمەوە، کەواتە هەم) هەوڵدەدا لە رێگەی بەرجەستەکردن و جێگیرکردنی ئەو (من)ەوە

وجودی شتەکان بسەلمێنێ، یان بەمانایەکی دیکە دەتوانین بڵێین لە سەدەی (حەقدەم)دا (دیکارت) پێویستی بەزەمانەتی خوایی دەبێ، تاکو دڵنیا بێ لەو راستییەی کە دەیبینێ، بەو مانایەش بەدەستهێنانی سەربەخۆیی عەقڵ وەک لە پەرەگرافەکەی سەرەوە هاتووە لە کوجیتۆی دیکارتدا هەرگیز تەعبیر لە رزگاربوون ناکات، بەقەد ئەوەی تەعبیر لە داهێنانی کۆت و بەندێکی دیکەی جیاواز دەکا، یان ئەگەر بەمانایەک لە ماناکان رزگار بوون بێ، ئەوا بەشێوەیەکی دیکەی جێگیرو دووبارە نەخشە بۆکێشانی بەندیخانەیەکی دیکەیە، هەرلەوێشەوە پرسیاری (دیکارت) دەبێتە پرسیاری ئەوەی کە دەیبینم خودی ئەو شتەیە کە دەیبینم، نەک دەستخەڕۆکردن وسەراب، دەشێ ئەوپەڕی بایەخ پێدانی خواوەند بێ، بەڵام خواوەند نەک بەمانا تیۆلۆژییەکەی بەڵکو بەمانا سێنترالیەکەیەوە.

لەلایەکی دیکەش (دیکارت) دووشت تێکەڵ دەکات بیرو خودی بیرکەرەوە، وەک دیارە کاتێک کە بیرێک بوونی هەبێ، دەبێ لە پشت ئەو بیرە بیرکەرەوەیەک بوونی هەبێ، بەڵام کە گومان هەموو شتەکان دەخوات، ئەو راستیە بۆ خۆی دەبێتە شتێکی گومان لێکراو.

لە دیدی دیکارتدا بە هیچ جۆرێک مافی ئەوەمان نییە وەک پێویست بڵێین بۆ ئەوەی فیکرێک بە دەست بهێنین دەبێ بیرکەرەوەیەک بوونی هەبێ، هەر لەسەر ئەو بنەمایەش کۆجیتۆکەی تەنها شتێک کە دەیسەلمێنێ ئەوەیە کە فیکر وجودی هەیە، وشەی (هەیە) زۆر بە ساکاری دەلالەت لەوە دەکات ئەو ناوەرۆکە، یان ناوەرۆکەکانی دیکە لە بازنەی وێناکردندا هەمیشە کورتی دێن.

لە کۆجیتۆی دیکارتدا ئەوەی کە بیر کەرەوە بە دەستی دەهێنی هیچ پاساوێک نییە، کەواتە لەبەرامبەر ئەوەدا دەشێ وەک (کیرکیجاد) بگوترێ (من بیر دەکەمەوە کەواتە من نیم) یان وەک (هۆسرل) لە بری (خود)ی دیکارتی کۆمەڵێک (خود)ی دیکە بهێنینە ناوەوە، وەک دیارە "هۆسرەل"(٥) لە رێگەی فینۆمینۆلۆژیاکەیەوە دەیەوێ لە بارمتەی خواوەند، یان بەمانایەکی دیکە لە بارمتەی سێنترالیەت رزگارمان بکات، لەوێشەوە کۆمەڵێک ئەزموونی خودی هێنا ئاراوە و ماهیەتی کۆتایی خستە نێو دووکەوانەوە، واتە تەئکیدی


دیکارت

■ (دیکارت) پێویستی بەزەمانەتی خوایی دەبێ، تاکو دڵنیا بێ لەو راستیەی کە دەیبینێ، بەو مانایەش بەدەستهێنانی سەربەخۆیی عەقڵ وەک لە پەرەگرافەکەی سەرەوە هاتووە لە کوجیتۆی دیکارتدا هەرگیز تەعبیر لە رزگاربوون ناکات■



دستویفسکی

■ دواجار دەردەکەوێ کە فیکرو فەلسەفە هەمیشە لەسەر تەجاوزکردن و بەرەوپێشچوون کار دەکەن، بەو مانایەش ئەمڕۆ قسە لە وازهێنان لە فەلسەفەی (خود) دەکرێ لەوێشەوە هەوڵ بۆ فەلسەفەیەک دەدرێ کە بکەر (فاعل) رۆڵی سەرەکی تیا وازی نەکات■

لە پێکەوە ژیان کرد، بەومانایەش فینۆمینۆلۆژیای (هۆسرەل) دەڵێ من بیر دەکەمەوە، تۆ بیر دەکەیتەوە، ئێمە گشتمان بیر دەکەینەوە، لێرەدا ئەوەی گرنگ دەکەوێتەوە بۆ ئەزموونەکانمان ژیانکارییە لە ئاگایی خودا، کەواتە فەلسەفەی (هۆسرەل) پرۆژەیەکی رەخنە ئامێزو هەڵوەشانەوە گەرایە، بەردەوام رەخنە لە سیستەمی ئاگایی و فەلسەفەی ئامادەگی دەگرێ.

بەڵام ئەوەی (گۆرگیاس) دەڵێ ئەوەیە کە هیچ شتێ بوونی نییە و ئێمە ناتوانین هیچ بناسین، بەو مانایەش هەموو شتێ جگە لە وەهم و دەسخەڕۆکردن شتێکی دیکە نییە، یان وەک (دیستۆفسکی) دەڵێ چیرۆکەکە شێتێک دەیگێڕێتەوە.

دواجار دەردەکەوێ کە فیکرو فەلسەفە هەمیشە لەسەر تەجاوزکردن و بەرەوپێشچوون کار دەکەن، بەو مانایەش ئەمڕۆ قسە لە وازهێنان لە فەلسەفەی (خود) دەکرێ لەوێشەوە هەوڵ بۆ فەلسەفەیەک دەدرێ کە بکەر (فاعل) رۆڵی سەرەکی تیا وازی نەکات، دەشێ ئەو فەلسەفەیەی کەواز لە خود دەهێنی لە چەمکی ئەپستمی (فۆکۆ) و فەلسەفەی بێ سەنتەری (دریدا) هەڵگرینەوە، یان بەمانایەکی بەرفراوانتر لە فیکری پۆست مۆدێرنەدا زۆر بەروونی رەنگدانەوەی هەیە.

کەواتە ئەمڕۆ دنیای فیکر بەردەوام لەبەرەوپێشەوە چوون خۆی دەنوێنێ، بەردەوام لە میانی بەدواداچوون و رەخنە و تیۆریزەکردنەوە هەڵوێستی سەردەمانەی خۆی بەرامبەر بە واقیع و ترادیسیۆنەکان دەخاتە روو، یان بە مانایەکی دیکە وەک (ئەرگۆن) دەڵێ فیکر دەکەوێتە ژێر کاریگەری بارودۆخ و فاکتەرە مادییەکانەوە، چونکە شتێک نیە لە دەرەوەی هەمو مەرجەکاندا بێ و لەهەوا مەلە بکات، وەک ئایدیالیستەکان و تەقلیدییەکان بیری لێ دەکەنەوە، بەڵکو مەحکومە بەکۆمەڵێک شت کە بەسەریدا دەسەپێنێ هەر لەوێشەوە بەرەو دەر ئەنجامی عەقڵی دەمانگوازێتەوە، کەواتە لێرەدا قسەکردن لە پێدراوی سروشتی و سەروەری خود دەبێتە قسە کردن لەو عەقڵەی کە جێگای سروش دەگرێتەوە و نکۆڵی لەسەرچاوە ترانسندنتالەکان دەکات، بەومانایەش مرۆڤ لە چوار چێوەی ئاکار دێتە دەرەوە و دەبێتە بونیاتنەری گشت بەهایەک و دروستکەری

هەموو ئامانجێکی باڵا.

وەک دەردەکەوێ (ئارکۆن) لەو کتێبەدا هەوڵدەدا پلە بە پلە بەدوای گەشەی فیکردا بچێ، لەوێشەوە بە نێو یەکدا چوونی خەیاڵی و عەقڵانی لە کۆنتێکستی فیکری سەردەمدا دەخاتەروو، هەروەک هەژموونی عەقڵانیەتی زانستی لە سەردەمی عەلمانییەتدا روون دەکاتەوە و لەوێشەوە ئەو رزگارکردنە گەورەیەی عەقڵ بەرجەستە دەکات، یان بە مانایەکی دیکە بەگشتی قسە لە عەقڵی (دیکارت) دەکات کە بە تێپەڕبوونی زەمەن بوو بە عەقڵێکی وشک و رەق و دۆگما، کاتێک (دیکارت) عەقڵی بەتاڵکردەوە لەهەر خەیاڵێک و پێیوابوو خەیاڵ شتێکە لە دەرەوەی عەقڵدایە، بەمە شارستانیەتی زانستی و پیشەسازی نوێ دامەزرا، بەڵام هاوکات کاریگەری خەیاڵ و تەڕایی خەیاڵی لە نێو برد و رۆڵی خەیاڵی لە بنیاتنانی شارستانیەت و کارکردندا پووچ کردەوە، کە دواجار ئەو عەقڵە دیکارتیە لە چەرخی ئەمریکی و تەکنۆلۆژی و ئیستیهلاکی گۆڕاو بوو بە عەقڵێکی ئامێری و تەکنیکی بەرتەسک و ژمێریاریەکی سارد(٧).

(ئەرگۆن) هەوڵدەدا لە کۆنتێکستی گەشەی مێژووی فیکر دووبارە رۆڵی خەیاڵ و ئەندێشە بەرجەستە بکات، سەرەڕای ئەو رەخنەیەی کە دەیگرێتە خولیای مرۆڤی خۆرئاوایی و دەست بەسەراگرتنی (حەقیقەت) لەلایەن خودی ئەو مرۆڤەوە.

بەرجەستەکردنی رۆڵی خەیاڵ ئەگەر بە دیوێک لە دیوەکان بەبیرهێنانەوەی ئەو هەموو رەخنەیە بێ کە بەرامبەر سێنترالیزم و عەقڵی سێنترالی و حەقیقەتخوازی تاکانە کراوەتەوە، یان بەمانایەکی دیکە قسەکردن بێ لە مرۆی فیکرو گوتاری پۆست مۆدێرنیتە، ئەوە بە دیوەکەی دیکە ئاماژەکردنە بە بنبەستبوونی فیکری ئایینی، ئەو بنبەستبونەش دەتوانین لە بەدواداچوونی بە پیرۆز راگرتنی ئەو فیکرەوە هەڵگرینەوە، یان لە بەمولککردنی حەقیقەت تەماشای بکەین، بەڵام هەرگیز ئەو جۆرە بە فیکری ئایینی (ئیسلامەوە) بەند ناکات، چونکە وەک دەزانین ئایین رۆڵی بنچینەیی لە لە دایکبوونی مێژووی کۆمەڵگادا بینیوە، بەڵام وەک (ئەرگۆن) دەڵێ ئیتر دەبێ لە جیاتی ئەوەی خۆمان بە شانازیکردن و تەمجیدکردنی ئەو کەلەپورە خەریک بکەین با لە کۆنتێکستی فیکری

**■ بەرجەستەکردنی رۆڵی خەیاڵ ئەگەر بە دیوێک لە دیوەکان بەبیرهێنانەوەی ئەو هەموو رەخنەیە بێ کە بەرامبەر سێنترالیزم و عەقڵی سێنترالی و حەقیقەتخوازی تاکانە کراوەتەوە، یان بەمانایەکی دیکە قسەکردن بێ لە مرۆی فیکرو گوتاری پۆست مۆدێرنیتە، ئەوە بە دیوەکەی دیکە ئاماژەکردنە بە بنبەستبوونی فیکری ئایینی■**



هاوچەرخـــەوە لێکۆڵینەوە لەبارەی کەلەپوورو کەلەپووری ئایینیەوە بکەین.

وەک لە پێشتر گوتمان ئەو بەدواداچوونە زۆر بە روونی لە ئەپستمی فۆکۆیی بەرچاو دەکەوێ وەک چۆن لای دریدا لە لەقبوونی پیرۆزی ئاخافتندا بەرجەستە دەبێ، هەروەها کاتێک (ئەرگۆن) قسە لە علمانییەت و ئایین دەکات لە پشت ئەو مەسەلەیەوە دەیەوێ بەدوای چەمکی زانستی و چەمکی خەیاڵدا بچێ، یان بەمانایەکی دیکە پەردە لەسەر ئەو دوو چەمکە هەڵداتەوە و خوێندنەوە و راڤە کردنە جیاوازەکانی بخاتە روو.

بەومانایەش دەتوانین بڵێین لە نێوان ئەو دوو چەمکەوە بیرکردنەوەی لێکجیا خۆی دەنوێنێ، بیرکردنەوەیەک کە خەیاڵئامێزە و لەوێشەوە بەردەوام سروشمان بیر دەخاتەوە و دواجار تەواوی بەرهەمهێنانەکانی خۆی لە کۆنتێکستی ئایینیدا دەبینێتەوە، لە بەرامبەر عەلمانییەتێک کە لە هەژموونی چەمکی زانستەوە خۆی نمایان دەکات و دواجار لە شۆڕشی پیشەسازی نوێ خۆی هەڵدەگرێتەوە، ئەو دوو بیرکردنەوەیە ئەگەر چی دوو دەرئەنجامی جیاوازی بەرهەم هێناوە، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا دەشێ لە چەندان خاڵ لە یەک نزیک بکەونەوە، چونکە هەتا ئەمڕۆش لە پاڵ چەمکی زانستی و عەقڵانیەتی زانستیدا، لەپاڵ بیۆلۆژیای گەشە کردوو فیزیای چەندایەتی ونسبیەتدا شوێنێک بۆ خەیاڵ لە ئارادایە، شوێنێک بۆ ئەفسوون و ئەستێرەگرتنەوە، لێرەوە بۆ زێتر روونکردنەوە و بەدواداچوونی فیکری (ئەرگۆن) دەتوانین رەخنەکانی "فیرباند"(٨) بۆ چەمکی زانستی بخەینەروو، رەخنەی "فیرباند" بۆ چەمکی زانستی بەرەتکردنەوەی ئەو بنەرەتانەوە بەندە کە خودی چەمکی عەقڵ و چەمکی زانستی لە سەردامەزراوە، ئەو وایدەبینێ کە عەقڵ هەر بەتەنها فاکتەرێک نییە، کە رووبەرووی تەقالیدەکانی دیکە دەبێتەوە بەڵکو لە خودی خۆیدا وەک هەر تەقالیدێکی دیکە وایە، کەوەک پێویست نە باشەو نەخراپ، هەر لەسەر ئەو بنەرەتەش پیرۆزی سینترالیەتی عەقڵ کە کەلەپووری رۆشنگەری مۆدێرنە چەسپاندویەتی رەتدەکاتەوە، ئەو پێیوایە لە نێوان عەقڵ و زانست دەبێ پارێزگاری لە یەکێکیان بکەین، ناشێ پارێزگاری لە هەردووکیان بکەین، چونکە رابوونەوەی

**■ هەتا ئەمڕۆش لە پاڵ چەمکی زانستی و عەقڵانیەتی زانستیدا، لەپاڵ بیۆلۆژیای گەشە کردوو فیزیای چەندایەتی ونسبیەتدا شوێنێک بۆ خەیاڵ لە ئارادایە، شوێنێک بۆ ئەفسوون و ئەستێرەگرتنەوە ■**

زانست بۆ خۆی لە دژی عەقلانییەت لە بیانووگەلێکی بەربلاوە وە هاتووە کە پێشتر بڕوای پێیان هەبوو، وەک چۆن هەر لە میانی ئەو بیانووە بەربلاوانەوە هاتۆتە ئاراوە کە بەدژی هەست و بەدژی دەرککردنی هاوبەش کەوتوونەتەوە، بۆیە دەبینین چەمکی زانست بە پێی سەردەم گۆڕانی بەسەردا هاتووە و دەکەوێتە ژێر نسیبیەتی مێژوویەوە - ئەوەش ئەو نسبیەتەیە کە (فێرباد) بەرگری لێ دەکات.

ئەو نسبییەتە بەشێکە لە خودی زانست، تیۆری فیزیای نوێی (زانستی)یش نکۆلی لێ ناکات، بەلکو دەیسەلمێنێ، کەواتە زانست سیستمێکی تایبەتی ناگرێتەوە بەلکو بەشێک لە بنەڕەتە سەرەکییەکانی کۆمەلگا پێکدەهێنێ، لە بەرامبەر ئەوەشدا مەحالە بتوانین خەیاڵ بخەینە دەرەوەی عەقڵ و بیرکردنەوە، بەومانایەش عەقڵ هەمیشە لە پەیوەندی بە خەیاڵ و خەیالکراو رۆلی خۆی پرۆسیسە دەکات. گەڕانەوەش بۆ خەیاڵ و خەیالکراو هەرگیز گەڕانەوە نییە بۆ سنترالیەت، بە قەد ئەوەی بەرگری کردنە لە حەقیقەت گەلێکی جۆراو جۆر، فرە حەقیقەتیش خۆی لە خۆیدا ئەقلێکی جەوهەری هەموو ئەو مەعریفانەیە بانگەشەی بابەتخوازی دەکەن، چونکە فرەیی رێگا بەوە دەدا بەتوندی رەخنە لە فیکرە مەقبولەکانیش بگیرێ، هەر لە میانی ئەوەشەوە دەشێ هەموو کۆمەلگایەک بەرگری لە پێکهاتەی عەقلی کەلتوری خۆی بکات، وەک چۆن بەرگری لە خەیالکراوەکانیش بکات، بەلام نەک بە شێوەیەکی دۆگمی خوازانە - بەلکو لە رێگەی بە دواداچوون و رەخنە و بیرکردنەوەی سەردەمەوە، بەومانایەش ئەوەی کە دەشێ بەرگری لێ بکەین هەموو ئەو ئیبداعانە دەگرێتەوە کە ئەمرۆ لە میانەی فیکری سەردەمدا وەک چرا رێگای فیکر رۆشن دەکاتەوە و دەشێ لە بەرەو پێشچوونی فیکرو مەعریفەدا رەنگدانەوەی ببینین، هەروەک چۆن دەبێتە بەشێک لە پێکهاتەی عەقلی مۆدێرن و دواجار وەک کۆشش و دەستکەوتەکانی رۆحی مرۆڤایەتی سەیر دەکرێ، کەواتە هەرگیز ناتوانین رابردوو بە هەموو ماناکانییەوە رەت بکەینەوە وەک چۆن ناشێ تەواوی ئێستاو داهاتوومان قبولّ بێ، لەلایەکی دیکەش راستە گۆڕانکاریەکانی دنیا بە هەمان ئەندازە کاریگەری بەسەر کۆمەلگای گەشە کردوو کۆمەلگای دواکەوتوو نییە، ولاتە پێشکەوتووەکان دەتوانن دەست بەسەر ئەو گۆڕانکاریە خێرایانە بگرن و کۆنترۆلی بکەن و هەرسی بکەن و وەری بگرن، هەروەک دەشتوانن بۆ باشکردنی ئاستی ژیانی خۆیان بەکاری بهێنن، بەلام ولاتە دواکەوتووەکان رەنگە نەتوانن بەهەمان شێوە دەستیبەسەردابگرن و سوودی لێ وەرگرن، بەلام هەرگیز ئەوە بەو مانایە نییە کە بەشێک لەو گۆڕانکارییانە دەستی ولاتە دواکەوتووەکانیشی تیا نەبێ، هەلەی گەورە لێرە سەر هەلدەدا کە پەراوێزوکەنار بە گێڕو ئیفلیج تەماشا بکەین، خودی ئەو تەماشاکردنە تەواوی کۆشش و دەستکەوتە فیکری و مەعریفییەکانی سەردەم کالّ دەکاتەوە و دووبارە بەرەو سێنترالیستمان دەکاتەوە کە فیکری سەردەم تەواوی وزە و تواناکانی خۆی بۆ هەلوەشانەوەی خەرج کردووە، ئەمرۆ فیکری پۆست مۆدێرنە و تێڕوانینی بۆ دەستکەوتە مرۆڤایەتییەکان هەرگیز پەیوەندی بە سێنترالیزمەوە نییە، بەلکو بەردەوام قسە لە شارستانی گەردوونی دەکات، کەواتە بۆچی خۆمان لەو خەونە مرۆڤایەتیە بێ بەش بکەین.

لێرەوە دەتوانین دووبارە بۆ پەرەگرافەکەی (ئەرگۆن) بگەڕێینەوە و جێکەوتی ئەو عەقلە خاکەڕاییە دیاری بکەین کە لەدوا هەلبەزین و دابەزیندا دووبارە سێنترالیەت لە دەست دەداو لەوێشەوە فرەیی دێتە ئاراوە، بەومانایەش دەشێ جێکەوتەی ئەو عەقلە فرە رەهەندەی کە

ئەمڕۆ لە میانەی فیکری پۆست مۆدێرنەوە خۆی دەخەملێنێ بە جۆرێک لە جۆرەکان بە خاکەڕایی عەقڵ لە بەردەم پێدراوی سروش تەماشا بکەین، بەڵام هەرگیز ئەو جێکەوتە لە ڕێگەی کۆپی کردنەوە خۆی نانوێنێ، بەڵکو لێرەدا جێکەوتەی عەقڵی بەو مانایە وەک چۆن جۆرێکە لە پەیوەستبوون بە پێشوو، بە هەمان شێوەش جۆرێکە لە ونبوون، یان بە مانایەکی دیکە مەبەست لە (ئەسڵێک) نییە کە بەرەو پێشوو دەگەڕێتەوە، بەقەد ئەوەی مەبەست لەبەردەوامیەت و بەرەوپێشچوون و گەشە کردنە، کەواتە ئەگەر خاکەڕایی ئەو عەقڵەی کە (لە بەردەم سروشت دەچەمێتەوە) تەعبیر لە ئەسڵ بکات، ئەوە جێکەوتەی عەقڵی ناوبراو بەرەو فیکری پۆست مۆدێرنە ئاراستەمان دەکات، ئەوەش ئەگەر لەلایەک (پچڕان) بێ و بەومانایەی کە (دواخستن) ڕوونی دەکاتەوە، ئەوا بە دیوەکەی دیکە (بەردەوامیەت)ـە بەو مانایەی کە هەڵگری شوناسی سەردەمەکەی خۆیەتی، کەواتە جیاوازی ئەو عەقڵەخاکەڕایە و جیاوازی عەقڵی پۆست مۆدێرنە لە گەڕانەوە بە مانای بەردەوامیەت و دواخستن بەماناپچڕان خۆی هەڵدەگرێتەوە، بەدیوەکەی دیکەش ئەوەی ئەمڕۆ وەک جیاوازی قسەی لێ دەکرێ ئەساڵەتی خۆی لە ڕێگەی کۆپی کردنەوە ناسەلمێنێ، یان لە ڕێگەی ئامادەگییە سێنتراڵیەکەیەوە، بەڵکو بەردەوامیەتی خۆی لە میانی جیاوازییەوە هەڵدەگرێتەوە، کەواتە ئەگەر خاکەڕایی عەقڵی لە پێشوودا پەیوەندی بە دەسەڵاتی سروشەوە هەبێ، ئەوە خاکەڕایی لە عەقڵی پۆست مۆدێرنەدا ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە فرە حەقیقەتەوە دەکات، لێرەدا بە جۆرێک لە جۆرەکان (پچڕان) وەک چەمکێک تەواوی کونتێکستەکانی پێشوو تێکدەشکێنێ و دووبارە لە کونتێکستی نوێ بە ئاماژەیەکی دیکە بەشداری دەکات، بەوەش ئامادەگی (سەرچاوە) مەحاڵ دەکەوێتەوە، چونکە تەنها لە کونتێکستی خۆیدا توانای بەشدار ...
هەیە، ئیتر لەوێوە (ئەرگۆن) ...
پەرگیربوون دەکات، قسە لەپەرگیربوو...
دەکات کە زیاد لە پێویست کەوتۆتە ...
شەیدایییە یەقینیانە دۆگمایییەکانی خۆیە...
پێیانوایە هەمیشە دەتوانن لە ڕێگەی کەلە...
خۆیانەوە تەواوی وەڵامەکان بەدەست ب...
هەروەک دەیانەوێ لە ڕێگەی پەرگیر بو...
تەمجیدکردنی و بە پیرۆز ڕاگرتنی کەلە...
واقیعە تایبەتیەکەی خۆیان پەردە پۆش ...
نەک هەر هێندە بەڵکو هەرگیز هەوڵ نادە...
شێوەیەکی زانستی لە پێکهاتەی عەق...
کەلتوری خۆیان تێبگەن، بە شێوە...
ئارکیۆلۆژیانە بە دوای پەنهان و ق...
لێنەکراوەکانیدا بچن، ئیتر پێیانوایە حەقی...
تەنها بەلای ئەوانەوەیە.

لەبەرامبەر ئەو فیکرە داخراوەدا د...
بڕوامان بە فیکرێک هەبێ کە بەردوام ڕە...
ڕاقەکاری و لێکدانەوەی نوێ دەخا...
بەردوام لە گۆڕانکاری دایەو وێناکردنی ...
دێنێتە ناوەوە، لەبەرامبەر فیکرێکی وادا ...
قسە لە داخران بکەین، یان بەمانایەکی ...
هەموو فیکرێکی ئەکتیڤ بەڕووی فیکر...
دیکە دا کراوەیە، لێرەوە لەگەڵ (ئەرگ...
دەتوانین بڵێین هەرگیز (ئیسلام) لە خ...
بەڕووی عیلمانییەت داخراو نییە، واتە ئی...
هەموو دەرگاکانی بە ڕووی عیلمانی...
دانەخستووە، جا بۆ ئەوەی موسڵمانان بک...
عیلمانییەت، ئەوە دەبێ خۆیان لە بە...
سەپاندن و کۆت و پەیوەندە دەروونی ...
زەمانەوانی و ئایدۆلۆژییەکان ڕزگار بکەن.(٩)

کەواتە دەرگا کردنەوەی ئیسلام بە ڕوو...
عەلمانیەتدا جگە لەوەی تەعبیر ...
بەردەوامیەتی بیرکردنەوە دەکات، بە دیوەک...
دیکە ئەکتیڤ بوونی فیکرو ئیبدا...
ڕابوونەوەو بوژانەوە دەگەیەنێت.

خۆرئاوا لە دوای شۆڕشی فەرەن...

رۆڵی خەیاڵ و خەیاڵکراوی لە فیکری پۆست مۆدێرنە بەرجەستە کردو لەوێوە فرە حەقیقەت و فرە ڕەهەندی کرانەوەو رەخنە و بەدوادا چوونی نەگوتراوەکانی هەڵگرتوە، بە دیوەکەی دیکەش بە هەڵوەشانەوەی لۆگۆس و سینترالیەت، ئەرزش و نرخی بۆ رووە جیاوازەکان و پەراوێزەکان گەڕاندەوە، کەواتە لە پاش شۆڕشی فەرەنسا گەڕانەوە بۆ خەیاڵ و خەیاڵکراو هەرگیز لە پەنا بردن بۆ (سروش) خۆی نادۆزێتەوە، چونکە ئەگەر گەڕانەوە بۆ خەیاڵ لە پێش شۆڕشی فەرەنسا و لە میانی ڕەهەندە ئایینیەکەیەوە، پەنا بردن بێ بۆ سروش تاکو لە رێگەی سروشەوە شوێنێکی بۆ چارەسەر کردنەکان چەنگ کەوێت، یان بە مانایەکی دیکە ئەگەر ئەو کات مرۆڤ لە بەرامبەر دیاردە سروشتیەکان لە هەموو چەکێ داماڵدرابێ، ئەوە ئەمرۆ ئەو گەڕانەوەیە بۆ خەیاڵ بایەخدانێکی مەعریفی نوێیە، ئەو گەڕانەوەیە، گەڕانەوە نییە بۆ رابردوو شێوازەکانی رابردوو، بەڵکو تیشک خستنە سەر ئەومەسەلەیە لە دوو توێی رەخنەو لێکۆڵینەوە و پشکنین و بە دواداچوونەوە، ئەوەش چەمکی (سروش) لە مانا تەقلیدییەکە رزگار دەکات، ئەو مانا و دەلالەتانە تەجاوز دەکات کەپێشتر باوەڕیان پێ هەبوو، بەم جۆرەش خەیاڵ دەبێتە بەشێک لە پێکهاتەی عەقڵی سەردەم، وەک چۆن بە دیوەکەی دیکەش راستەوخۆ تەعبیر لە گەڕانەوەی ئەرزش دەکات بۆ ئایین و بەرز نرخاندنی پێکهاتەیەک لە پێکهاتەکانی فیکری ئایینی دەگەیەنێ، بەڵام نەک بەو مانایەی کە ئایین تەواوی بەشەکانی دیکەی عەقڵ و بیرکردنەوەو مەعریفە بخاتە ژێر رکێفی خۆی، بەڵکو بەو مانایەی کە ئایین دەشێ وەک بە شێک لە پێکهاتەی عەقڵ و بیرکردنەوەی ئەمرۆ رۆڵی خۆی بگێڕێ، هەر لەوێشەوە ئایین دەتوانێ بەشداری لە عەقڵی سەردەمدا بکات و دەرگا بەرووی فیکرو مەعریفەی سەردەمدا بکاتەوە، وەک چۆن هەر لێرەشەوە دەشێ بەشێک لە گۆڕانکاریەکانی سەردەم لە بەردەوامیەتی فیکرو مەعریفەدا هەڵگەڕێنەوە، کەواتە مێژووی گەشەی فیکری لە مێژووی تەواوی فیکرە جیاوازەکان پێکهاتووە، بەڵام لە گەڵ ئەوەشدا ئەمرۆ فیکر ئەوە نییە کە تەواوی یەکە ئامادەکراوەکان لە خۆ بگرێ، بەڵکو ئەمرۆی فیکرو مەعریفە شێوازی بەرهەمهێنانی ئەو یەکە فیکرییانە دەگەیەنێ، هەرلێرەشەوە ئارکۆن پێیوایە عەلمانیەت کە بەرهەمی فیکری پۆست مۆدێرنەیە، بەر لە هەر چی یەکێکە لە کۆشش و دەستکەوتەکانی رۆحی بەشەریەت.

## پەراوێزو سەرچاوەکان


١- بڕوانە (عەلمانیەت و ئایین) د.موحەمەد ئەرکۆن لەوەرگێڕانی (ئەوزاد ئەحمەد ئەسوەد) زنجیرەی کتێبی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ژمارە (٢٠١)ی (٢٠٠٥) ل٤٠.

٢- بڕوانە: الكتابة والاختلاف، جاك دريدا - ترجمة كاظم جيهاد - تقديم، محمد علال، دار توبقال للنشر ١٩٨٨.

٣- بڕوانە: مدخل الفكر الفلسفي، جوزيف بوخنيسكي - ترجمة: د.محمود حمدي زقزوق. دار الفكر العربي/١٩٩٦ ل ٣٩ (گۆرگیاس.٤٨٣-٣٧٥، پ م، فەیلەسوفێکی سۆفستایی گومانکارە).

٤- بڕوانە: هـ.س.پ. ل٤٠-٤٤ (دیکارت.١٥٩٦-١٦٥٠).

٥- بڕوانە: گۆڤاری، الفكر العربي المعاصر، ژمارە (٦/٧) نووسینی جۆرج زیناتی.

٦- بڕوانە: عەلمانیەت و ئایین. هـ. س. پ. ل٧٥.

٧- هـ. س. پ. ل٦٣.

٨- بڕوانە: (www.alimparatur.com) نووسینی: جەوودەت زیادە.

٩- عەلمانیەت و ئایین. هـ. س. پ. ل٧٣.

١٠- هـ. س. پ. ل٢٣.

# کورد و
# ئەڵقە لە نێو یەکەکانی
# ئینتیما

**محەمەد تەها حوسێن**




نیشتیمانپەروەری
ناستێکە لە ناستەکانی
نینتیما،
یا جۆرێک لە جۆرەکانیەتی،
هەر بۆیە لێرەدا(نینتیما)
وەک چەمکێکی
گشتی دەخەمە پێشەوە و
لەو حاڵەتەدا بە ناسایی
نیشتیمانپەروەری
دەبێ بە باسێک
لە باسەکانی یا بازنەیەک
لە بازنەکانی نینتیما.

ئینتیما توخمێکی هەرە بنچینەیی بەیەکەوە ژیانە، ئەگەر لە دنیای بوونەوەرە ناعاقڵەکاندا تەنها لە بەیەکەوە ژیان و هەڵکردنی هاوخەسڵەت و رەگەزەکاندا دەردەکەوێ، ئەوا لە مرۆڤستاندا سەرەڕای هاوڕەگەزی و هاوخەسڵەتی و هاوخوێنی ئینتیما تێکەڵی ئیرادە دەبێ و دەچێتە نێو قوڵایی پێدراوە عەقڵی و فیکریەکانی ئینسانەوە و هەمیشە ئەو توخمە مانای پەیوەندیەکانی تاک لەگەڵ خۆیی و ئۆرگانە کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری و فەرهەنگیەکان دەگەیەنێ و توندو تۆڵی و شل و شۆقی پەیوەندیەکانی هەر تاکێک بە ئۆرگان و ژینگە جیا جیاکانی دەوروبەریەوە راستەوخۆ توندی یا شلۆقی ئینتیمای تاکەکان دەگەیەنێ.

بەدوو دیودا دەتوانین رەسمێک بۆ ئینتیما بکێشین، لە دیوێکدا ئەوەتا تۆ سەر بە نەتەوە و نیشتمانێکی و لە بازنە بچوکەکانیشدا لە عەشیرەت یا بەرەباب یا خێزانێکەوە کەوتویتەوە، ئا لێرەدا تۆ بەدەر لە ئیرادەی خۆت لە رەگێکەوە شین بوویت و گیانت کەوتۆتە بەر، بەمانا لە ئاستە لەپێشەکانی ئینتیمادا کە ئینتیمایە بۆ خاک و نەتەوە و

هاوخوێن و هاوتۆوەکانت توخمی ئینتیما کارکردێکی ڕۆحی دەبێ و کەسی چاک و خراپ، ڕاست و خوار، دڵسۆزو نادڵسۆز،....تاد، هەر لە ژینگەکەی خۆیدا هێز وەردەگرێ یا بۆی دەگەڕێتەوە، بە واتایەکی دیکە کەسەکان لەو جۆرە ئینتیمایەدا تەنها خەلقەندەی ژینگەیەکن و لەو ئاستەدا هەڵگری خەسڵەتی هاوبەشی کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆژی و تا ئاستێک کولتوری هاوبەشن. بەدیوەکەی دیکەشدا ئینتیما تێکەڵەیەکە لەئاستە سەرەتاییەکانی خۆی و ئیرادەی تاکەکان، لەوەیاندا من یا تۆ یا هەرکەس و هاووڵاتییەکی دیکە بە هوشیاریەوە بڕیار لە ئینتیماکردنمان دەدەین بۆ ئەڵقەو بازنەکانی دیکەی ئینتیما یا بۆ ئۆرگانە جۆراو جۆرەکانی کۆمەڵگە، ئالێرەشدا ئاستی سازان و گونجانی زەمینە بۆ ئەو جۆرە ئینتیمایە ڕۆڵی سەرەکی لەو بڕیارە خودی و تەواو عەقڵیەدا دەگێڕێ. هەر لێرە ئینتیما بە کۆمەڵە مەرجێکەوە دەبەسترێتەوە و بە زەرورەت هەموو ئەوانەی پێیان دەڵێن مەرجەکانی ئینتیما بۆ بیناکردنی ئەو چەمکە دەبن بە بونیاد.

مەرجەکانی ئینتیما چەند فیزیکین، ئەوەندەشیان ڕاستەوخۆ پەیوەندیان بەو سیستمانەوە هەیە کە مرۆڤ لە ژیانی کۆمەڵایەتی خۆیدا بە مەبەستی سیستماتیک کردنی ئیش و کار و ماف و ئەرکەکانی دروستیان دەکا، لەوەش واوەتر ئینتیما هەندێ پاڵنەری غەریزی لە پشتەوەیە ڕێک لە قولاییەکانی تاریکایی-خود-ی هەرکەسێکدا دەردەچن. بەو پێیە لە پێناسەیەکی وەسفیانەدا هەروەک ئەبراهام ماسلۆ تیۆریزەی کردووە ئینتیما دەبێ بە پێویستیەکی گرنگی سەرخانی کەسێتی هەر کەسێک و لە کاروانی هەوڵدانیدا بۆ وەدیهێنانی خود-تحقیق الذات-دا پایەیەکی سەرەکیەو بێ ئەو توخمە کەسە ئادەمیەکان تەنها بۆ سک و بەرسکیان ماندوو دەبن و هەر بە تەنها خولیای دەستەبەرکردنی فەزایەکی ئارامیشیان بۆ (مانەوە) لەسەردایە.

ئالێرەدا ستراتیژیەتی تاک تەنها (مانەوە)یە وەک بوونێکی بایۆلۆژی و زۆربەی ئەو پەیوەندیانەش کەلەدەرەوەی خۆی بەئۆرگان و دامەزراوە کۆمەڵایەتی و



ئەبراهام ماسلۆ

**■ ئینتیما توخمێکی هەرە بنچینەیی بەیەکەوە ژیانە، ئەگەر لە دنیای بوونەوەرە ناعاقڵەکاندا تەنها لە بەیەکەوە ژیان و هەڵکردنی هاوخەسڵەت و ڕەگەزەکاندا دەردەکەوێ، ئەوا لە مرۆڤستاندا سەرەڕای هاوڕەگەزی و هاوخەسڵەتی و هاوخوێنی ئینتیما تێکەڵی ئیرادە دەبێ و دەچێتە نێو قوڵایی پێدراوە عەقڵی و فیکریەکانی ئینسانەوە ■**

**لەدوا پێناسەدا ئینتیما دەبێ بە کۆمەڵە رەفتارێکی دەروونیو جەستەیی تاک لەگەڵ خۆیی و دەورو بەرەکەیداو ئەلبۆرت وتەنی وەک خەسڵەتێکی قووڵ بەکەسەوە دەلکێ**

سیاسی و فەرهەنگییەکان دەبیەستێتەوە ناچنە نێو چێوەی ئینتیما بەمانا ئاساییەکەی، بەڵکو تەواو بە ئینتیمای ساختە لێکدەدرێتەوە، ئینتیمای ساختە بۆ سەندیکاکان،حزبەکان، ئۆرگان و دامەزراوەکانی دیکەی کۆمەڵگە.

دوای ئەم وردبوونەوەیە لەم چەند ئەلتەرناتیڤە کامیان بۆ ئینتیما راست دەردەچن؟:-

* ئینتیما وەک چەمکێکی سایکۆلۆژی ئینتیما وەک چەمکێکی سۆسیۆلۆژی.

* ئینتیما وەک چەمکێکی سیاسی ئینتیما وەک چەمکێکی فەرهەنگی یا ئابووری.

هەڵبەتە هەموو ئەوانە رەهەندەکانی پێکهاتنی ئینتیمان و یەک بەیەک دەکرێ بیانخەینە نێو ئەڵقە یەکتر جوداکانی و بۆ ئێ فەزای جیا جیا کەمێ لێکی دوورخەینەوە. بۆ نموونە ئینتیما بۆ رێکخراو پارتێکی سیاسی و ئیشکردن لەنێو حزبێک دەکەوێتە خانەی ئینتیمای سیاسیەوە کەسی مونتەمی لەو رایەڵەی پەیوەندیەوە دەچێتە ئێ پرۆژەیەکی سیاسی و دەبێ (بوونەوەرێکی سیاسی) بەهەمان شێوە ئینتیما سەندیکا یا ئۆرگانێکی فەرهەنگی کەسی مونتەمی دەباتە نێو کۆمەڵە سرووت بەهاو ئینجا پرۆژە کولتوریەوە و دەیکات بوونێکی فەرهەنگی و لەوێ شوناسی خودی کولتوری خۆ وەردەگرێ. هاورێ لەگەڵ ئەوانەدا ئینتیما بۆ هە فەزایەکی دیکەی (کۆمەڵایەتی-ئابووری- نەتەوەیی-رەگەزی - گرووپ پەراوێزەکانی کۆمەڵگە ئینتیما بۆ کەس دیار دەک ئەو کەسە لە هەر یەک لە بوارانەدا خۆی دەناسێتەوە لێرەدا ئەگەر ئینتیمامان بردەوە نێو کارلێکێکی دینامیکیانەی هەموو ئە فەزایانەی قسەمان لەسەر کردن ئەوا لەدوا پێناسەدا ئینتیما دەبێ بە کۆمە



گرافیک: وەلید ستی

رەفـــتــــارێکی دەروونیـــو جەستەیی تاک لەگەڵ خۆیی و دەورو بەرەکەیداو ئەلبۆرت وتەنی وەک خـەسـڵـەتێکی قـووڵ بەکـەسـەوە دەلکێ و پێی دەناسـرێتـەوە.رێک لێرەدا ئینتیما حەقیقەتێکی سـایکۆلۆژیەو لەنێـو خـودی هەر کەسێدا پێکدێت.

بەدەر لەو راستیە فیکریە تا ئەمـرۆ ئینتـیـمـا لە خۆرهەڵاتداو بەتایبەت لای خـۆمـان بەتەنهـا رەهەندە سیـاسیـەکەی وەرگـرتووە و ئەگـەر وردترو ئاشکراتر بۆی بچین دەڵێین لـە تێگەی بە تەنها سیاسەتەوە ئینتیما دادەرێژرێ و سـیـاسـەتیش دیسـانەوە هەر بەتەنهـا لە ئینتـیـمـاو زەقتـریش لە ئینتیمای ساختە بۆ حزب و رێکخـراوە سـیـاسـیـەکـان دەبینرێ. کـەسـێک ئەگـەر ئینتـیـمـایەکی سـیـاسی دیسـپلینکراوی حـزبیـانەی نەبێـو ئەندامی حـزب و گروپێکی سیاسی نەبێ ئەوا کـەسێکی (لامنتـمی) یەو عەیارەکانی دیکەی ئینتیمای ناتەواوە. بەمانا کـەس دەبێ تەنهـا لە رێگای ئۆرگـانی حـزبیـــەوە پەیوەندی بەنیـشـتـیـمـان و نەتەوە ببەستێ و هەر پەیوەندییەکی لەم جۆرە بەدەر لە میانگیری حزب و رێکخراوی سیاسی بۆ کەسی بێ ئینتیمای حزبی بە جـۆرێک لە هەڵگەڕانەوە یا لە سوکترین تۆمەتی حزبدا بەبێ باکی لێکدەدرێتەوە.



ئەمە لە کاتێکدا ئینتیما بۆ نیشتیمان ئینتیمایە بۆ (شوێن) شوێنیش بۆ کەسی مـــــرۆڤ پڕیەتی لەو پێدراوانەی وەڵام و رەفتـارو پرسیاری لا دروست دەکەن و لەوێوە پەیوەندی خـوێن و خـزمـــایەتی و زمـــان و مێژوویەکی لەگەڵ کەسانی دەوروبەری بۆ پێکەوە دەنێ و لەو حاڵەتەشدا ئینتیما بۆ شوێن واتە (نیشتیمان) هێـــزێکی رۆحی دەبێـــو هەمـــیـــشـــە لەو شـــوێنە فانتازیای دنیایەکی جوانتر دەخولقێنێ و لە دوریشەوە هەردەم بۆی دەگـەڕێتـەوە. کـەواتە لێرەدا ئینتیما بۆ (شوێن-نیشتیمان)تەواو رەفتارێکی سروشتیانەو هێزێکی کێشکردنی رۆحی

**■ ئینتیما بۆ (شوێن-نیـشـتـیـمـان) تەواو رەفتارێکی سروشتیانەو هێزێکی کێشکردنی رۆحی دەبێ و هەمـــوومـــان لە نیشتمان دەبین و لەهەر شوێنێکیش بین بەجۆرێک لە جـــۆرەکـــان بۆی دەگەڕێینەوە ■**

دەبێ و هەموومان لە نیشتمان دەبین و لەهەر شوێنێکیش بین بەجۆرێک لە جۆرەکان بۆی دەگەڕێینەوە. تائێستاش نیشتیمان ئەو شوێنەیە رایەڵە بەتینەکانی ئینتیمای لێوە دەکێشرێ و لەگەڵ ئەوەی خەریکە لەو زەمەنەی گلۆبالیزمدا نیشتیمان سنوورەکانی بۆ دنیا دەکاتەوە و تادێ بەقەد دنیا گەورە دەبێ، بەو مانەیە جیهان بەرەو ئەوەیە شکڵ و شێوازی دیکە لە نیشتیمان بدۆزرێتەوە، کەچی هەردەم روحەکان بەرەو سەر زەمینەکانی خۆیان هەڵدەفڕنەوە.

ئالێرەداو رێک لەم زەمەنەدا (شوێن) دەکەوێتەوە نێو فەرهەنگی دیکەی (مانا) وەو نەک تیایدا نامرێ هەروەک (ڤێریللو) پێیوایە زەمەن زەمەنی مردنی جوگرافیایە بگرە لەو فەرهەنگەدا (شوێن، جوگرافیا ،نیشتیمان) بەگیانی تازەتر دەژیێنەوە. لەو نیشتیمانە تازەیە میکانیزم و فۆرمەکانی ئینتیماو شکڵ و شێوازەکانی دەگۆڕێن، پەیوەندییەکان لەهەر هەموو فەزاکان لە گۆڕاندان، لەگەڵ نیشتیمان و شوێنیشدا (هاونیشتیمان بە شێوازی تازە پەیوەند لەگەڵ نیشتیمان گرێدەدا مانایەکی دی لە سیستەم دیکەی پەیوەندیدا لەگەڵ رێک دەکەوێ و لە خەیاڵ ئەو سیستەمەشدا چیدیک نیشتیمان جوگرافیایەکی سیاسی دامەزراو لەس هەواو هەوەسی سەرکەوتوان جەنگە دابەشکر جیهانیەکان نییە، بەڵک بەقەد جوگرافیای زمان کولتورو نەتەوە فراو دەبێتەوە. کەواتە کاتی ئەو هاتووە بەر لەوەی قسە لەس سەرەتاکانی نیشتیمانپەروەری و هێما روخسارو گەوهەرەکانی بکەین ئەم پرسیارە لەخۆمان بپرسین:

ئایا مرۆڤی کورد لەهەل و مەرجی ئێستای پەیوەندییە سیاسی و نێودەوڵەتیەکاند زیاتر ئینتیما بۆ کورد یا بۆ کوردستان تیژ دەکاتەوە؟ هەڵبەتە ئینتیما بۆ کورد مانا نەتەوەییەکەی ئینتیما دەگەیەنێ و بۆ (کوردستان) یش ئینتیمایە بۆ نیشتیمان. بێگومان لە ئێستادا کەس و دەوڵەت و لایەنێک چیدیکە ناتوانن کورد بوون قەدەغە بکەن و ئەگەر بەر لە ئێستا لە پرۆژە گەلی جیاجیاداو بەبەرنامەی

■ ئەگەر هەستی نەتەوەیی وەک جۆرێک لە ئینتیما لای هاووڵاتی دابەزیبێ ئەوا سەرەڕای دەرکەوت و دیاردەی دیکەی سیاسی زانستی- کولتوری- کۆمەڵایەتی بەر لەو کەسانە یا هاووڵاتیانە حزب و ڕێکخراوو ئورگانە سیاسیە نەتەوەگەراکان بەرپرسیاری ژمارە-١-ی ئەم دیاردەیەن ■

ڕێکوپێک شەڕ لەگەڵ ئەو جۆرە ئینتیمایە کراوە، وەلێ ئێمەی کورد لەهەر ڕاگەیاندنێکی جۆری ئینتیمادا یەکسەر بۆ(نەتەوەی کورد) هێمای ئینتیما دەکێشین، بەڵام بەهەمان ئازادی،ئازایی،ئاشکرایی، ماف دەتوانین کوردستان وەک سەرزەمینێک بۆ کورد بکەین بەسەرچاوەیەکی دیکە یا فەزایەکی دیکە بۆ ئینتیما؟ ئەمەیان دەمانباتە نێو دیبلۆماسیەت و من لەو هەرێمەی خۆمدا تەنها ئەوەندەم لێ قبوولە بڵێم خەڵکی کوردستانم،هەڵبەتە کوردستان لێرەدا هێمایەکی دیبلۆماسیە بۆ بەشێکی کوردنشین لە جوگرافیای دەوڵەتێکی غەیرە کورددا، ئەمە ئەگەرچی ئەم شوێنە بچوکەش لە کوردستان لای هەندێ ناوەندو لایەن و پڕۆژەی ئەنتی کوردبووندا بەو هێمایە نازانرێ ئینتیمای نیشتیمانپەروەری بۆ بکرێ و بەردەوام لەلایەن پارێزەرە دەروێشیەکانی سیستمە کلاسیکیەکەی پەیوەندی جیهانیدا پیلانی ئەوەی لەسەرە ببێ بەو سەر زەمینەی هەمیشە سەرقاڵی بەرهەمهێنانی دڵەڕاوکێیەکی بەردەوام بێ.

ئەمانە ڕاستیە دیفاکتۆییەکانی ئێستای ئینتیمای سیاسیو دیبلۆماسیانەی نیشتیمانین.گەر بشچینە ناخی هەرکەسێکی کورد لەوێوە هێڵەکانی ئینتیما درێژ بکەینەوە ڕێک بازنەیەکی زۆر گەورەترمان لە (شوێن) بۆ دەردەکەوێ هەر ئەو شوێنە ئەو کەسە هەمیشە ئینتیمای ڕاستینی بۆ دەکا. کەواتە لە ئینتیمای نیشتیمانیدا کەس و تاکی کوردی ئەگەرچی نیشتیمانێکی لەناخی خۆیدا هەڵگرتووە و لە خەون و خەیاڵ و یوتوپیاکانیدا هاووڵاتی ئەو نیشتیمانەیە، وەلێ لە نێوان ئەو ئینتیما سروشتی و ئەم ئینتیما جیۆسیاسیە تازەیەدا لە ناکۆکی و نائارامیەکی دەروونی، کۆمەڵایەتی، سیاسیدایەو خودی ئەم حاڵەتە لە ناڕامی دەروونی کەسی کوردی وای کردووە هەمیشە هاووڵاتی کورد،کەسی کورد، بۆ ئامانجی دیکە بڕوانێ کە لەگەڵ ئامانجەکانی دیکەی لەدەرەوەی خۆی بۆی دانراون یەکناگرنەوە. ئێمە لێرەدا لە نێوان هەردوو چەمکی (ئینتیما- نیشتیمانپەروەری) دێین و

■ شەڕی ناوخۆ هەمیشە ئەو کارەساتە مەزنە بووە هەردەم ئینتیمای بردۆتەوە نێو جغزو قەوارە بچوکەکان■

■ ئینتیما پێویستیەکی تاکە بۆ ئەوەی هاوسەنگانە (کەس) خۆی لە چوارچێوەی سیستەمێکدا وەدی بێنێ، وەلێ بەبێ بوونی مەرجە سەرەکیەکان هەرگیز ئینتیما تەمام عەیار نابێ ■

دەچین و مادامەکێ کەسی کورد لەو هەرێمەی کوردستانی خۆماندا کەسێکی مونتەمیە چ لەرووی سروشتیەوە بۆ نەتەوە و کۆمەڵەکەی خۆی چ لەرووی عەقلانیشەوە هەست دەکا لەدەرەوەی پرۆژەی سیاسی-کولتوری- کۆمەڵایەتی ئەو نەتەوەیە لەم ناوە هیچی بۆ ناکرێ.

کەواتە(ئامادەگی ئینتیما) بۆ نەتەوە لای کەسی کورد هەمیشە لەجێی خۆیەتی و لاوازی و بەهێزی یا ونی و ئاشکرایی دەکەوێتە سەر ئەو پرۆژانەی بەنێوی نەتەوە لە لایەن حزب و رێکخراوە نەتەوەییە کوردیەکانەوە گەڵاڵە دەبن. بۆ نموونە ئەگەر هەستی نەتەوەیی وەک جۆرێک لە ئینتیما لای هاووڵاتی دابەزیبێ ئەوا سەرەڕای دەرکەوت و دیاردەی دیکەی سیاسی زانستی- کولتوری- کۆمەڵایەتی بەر لەو کەسانە یا هاووڵاتیانە حزب و رێکخراوو ئورگانە سیاسیە نەتەوەگەراکان بەرپرسیاری ژمارە-١-ی ئەم دیاردەیەن، چوون ئەوان حاڵی حازر نمایشگەرو کاراکتەری دەسەڵاتی کوردین و هاووڵاتیانیش چاودێرو بینەرو هەڵسوڕاوی نێو گەمەکەن. ئەگەرچی هەروەک لە پێشەوە وتمان ئینتیما ئاست و ئەڵقەی جیاجیای لەناویەک و لەسەر یەکی هەیە، وەلێ لەجۆری ئینتیمای هاونیشتیمانی و نەتەوەییدا(هاووڵاتی- تاک) لە بژاردەی سیاسی نەتەوە بەروەڕەوە کە حزب و رێکخراوی سیاسین خۆی ئۆرگانیزە دەکاو لە دروشم و ئامانجەکانی ئەوان و لە فەرهەنگی سیاسی ئەوان مانا بۆ چەمکی ئینتیما دەدۆزێتەوە. ئەمە لەو کاتەدا کە پرۆژە کولتوری و سیاسیەکان تەنها ئیشی حزبی سیاسی بوون و هەر ئەوان دەبوایە پارێزەری ئەو کولتورە بن و ئەوانیش لە پێکهێنانی رای نەتەوەییدا سەرقافڵەبوون. هەندێ جار ئینتیما لە خۆیدا دەبێتە کۆمەڵە پرسیارێک و لەنێویاندا ئەم پرسیارە چەند بمانەوێ ئەبستراکتیانە بیکەین، ئەو بینمان دەگرێ و دەیەوێ بەرروونی بێتە نێو قسەکانمانەوە، ئەویش ئەوەیە: ئەو سەر زەمینەی ئینتیمای بۆ دەکەین ئەگەر بە (رەمز)یش بێ بەچی ناوی بنێین؟ تاوەکو سنووری ئەو - متغیر- ە دیار نەکرێ لە توانادا نابێ ئاستە بەرزو نزمەکانی ئینتیمای

نیشتیمانپەروەری بپێوین و ئەگەر لە چەمکە گشتیەکەی خۆشیداو بەپانی بێ دیارکردن ئینتیما بۆ کوردستانی ناو بنێین، ئەوا دیسانەوە بەناچاری دەچینەوە نێو ئەو نیشتیمانەی بەپانتایی زمان و کولتوری کوردی بەرین بۆتەوەو هەموومان سەرزەمینەکەی دەناسین و بە ناچاریش دەبێ ئینتیمای نیشتیمانی ببەینەوە نێو جوگرافیای دەروون و زاتی کوردەکان، ئەمەش لە سیاسەت و باسەکانی ئینتیمای ئاشکرامان دوور دەخاتەوە. بەڵام با هەر لەدەوری چەمکە گشتیەکە بین و بکەوینە قسە لەسەر مەنزوری دابەزینی هەستی نیشتیمانپەروەری و ئینتیما بۆ کوردستان.

پێکهاتنی نیشتیمان بەو فۆرمانەی کە ئێستا لە یاساو پاکتە نێو دەوڵەتیەکان ڕەچاو دەکرێن زادەی فیکری نەتەوەیین لە هەمان کاتدا هەروەک فیکتور زاسلاڤسکی دەڵێ: (نەتەوە گەرایی میتۆدێکی سیاسی و گۆڕانێکی کۆمەڵایەتیەو هاو جووت بوونی کولتوری نەتەوەییە لەگەڵ کیاندا)، هەر بۆیە تائێستاش بەو جۆرە دەوڵەت و نیشتیمانانە دەڵێن (قەوارەی نەتەوەیی)، ئەگەر چەندین وڵات و نیشتیمانیش هەن لە چەندین نەتەوە و ڕەگەزی جیاجیا پێکهاتوون، وەلێ لای ئێمەی کورد هەمیشە نیشتیمان ئەو سەرزەمینە بووە کە بە فراوانی کولتوری کوردو نەتەوەی کوردی لەسەر بڵاو بۆتەوە. بەمانا جوگرافیای ئەتنیکی راستەوخۆ ئەو نیشتیمانە بووە کە کورد هەمیشە ئەگەر بەواقیعیش تیایدا نەبووبێ، نیشتیمانێک بووە لە خەونەکانی خۆیداو بۆ ئەو نیشتیمانە ئینتیمای هەبووە. لەدەرەوەی ئەو ئینتیما یۆتۆپیەی باسمان کرد چەمکی ئینتیما بۆ نیشتیمان لای خۆمان یا ئەوەتا بە ناچاری بەش بەش دەبێ و بە تەنیا هەرێمی کوردستانی عیراق ئەو نیشتیمانەیە کە پابەند دەبین پێی، یاخوود سەرەڕای ئەو ئینتیمایانە یەکێکی دیکەشی هاتۆتە سەرو ئەمجارە پابەند دەبین بە ئینتیما بۆ دەوڵەتێکی فرە نەتەوە کە هەر ئێستا ئێمە شوناسی نیشتیمانی ئەومان هەڵگرتووە.

لەو حاڵەتەدا تا ئێستا ئێمە جگە لە ئینتیما بۆ نەتەوە، بۆ کولتور، ئەوەندە لە ئینتیمای نیشتیمانیدا فەزای بونیادنانی بنچینەکانی ئەو ئینتیمایەمان بۆ نەڕەخساوە. هەڵبەتە ئەوە بەمانا ئەوەنیە تاکی کورد ناکرێ نیشتیمان پەروەر بێ، چوون نیشتیمانپەروەری تای دووەمی تەرازووی فیکری نەتەوەییە هەر لەبەر ئەوە تا ئەمڕۆ ئێمە پرۆژەیەکی یەکگرتووی پەروەردەو ئاراستەکردنی نیشتیمانپەروەریمان نەبووەو پرنسیپەکانی پاراستنی نیشتیمان لە بنەما بنچینەییەکانی ئاسایشێکی نەتەوەیی تۆکمەوە سەرچاوە دەگرن. بابێینە سەر دابەزینی ئاستی ئینتیما لای کەسی کوردو بیرنەکردنەوەی لەو توخمەگرنگەی هاوولاتیبوون.هەڵبەتە هەروەک لە پێشەوە ئاماژەمان بۆ کرد ئینتیما پێویستیەکی تاکە بۆ ئەوەی هاوسەنگانە (کەس) خۆی لە چوارچێوەی سیستەمێکدا وەدی بێنێ، وەلێ بەبێ بوونی مەرجە سەرەکیەکان هەرگیز ئینتیما تەمام عەیار نابێ، گرنگترین مەرجەکانی ئینتیما بۆ هاوولاتی دەستەبەر بوون و وەدی هاتنی پێداویستیە فسیۆلۆژییەکانیەتی کە راستەوخۆ ئەم پێداویستیە بوونی سیستم و پلانێکی ئابووری مەحکەم دەگرێتەوە هەتا ئەو ئاستە کارابێ هەرگیز تاک بۆ تێر کردنی سک و بەرسکی بەلا ڕێکاندا نەڕواو هەرگیزیش وای لێ نەیەت تەنیاو تەنیا بیری هەر لای سکی بێ، چوون تاک ئەگەر سەرچاوەی هێزی کە

خواردنه له هەڕەشه دابێ ئەوا تەنیا ئینتیما بۆ ئەو شوێنانه دەکا که خواردن و پێویستیەکانی دیکەی مانەوەی بایۆلۆژی لێیه.

دووەم مەرجی سەرەکی ئینتیما پێداویستی ئەمن و دابینکردنی ئاسایشی کەسەکانه له ناو تۆڕی چنراوی کۆمەڵگەدا. هەڵبەته ئەو لایەنه راستەوخۆ پەیوەندی بەو هەڕەشانەوە هەیه که دەچنه سەر کەس و نائومێدی دەکەن له ئەمن مانەوەی خۆی. له هەرێمی کوردستاندا سیستەمی ئابووری و سەرچاوەکانی بژێوی خەڵک له ناوەندێکی بڕیاری تەواو سەربەخۆی کوردییەوە پلان ڕێژ ناکرێن،بەمانا پلانی ئابووری و سیاسەتی گەشەپێدان راستەوخۆ له ناوەندێکی دەسەڵاتێکی سیاسی یەکگرتووی خاوەن سۆبێکتێکی دانپێندراو بەرنامه ڕێژ ناکرێن، هەربۆیه لەگەڵ مانەوەی نائارامی سیاسی له تەواوی عیراق و ناوچەکه به گشتی کەشێکی تەواو ڕوون بۆ پلانی پەرەسەندنی ستراتیژی فەراهەم نابێ، لەوانەیه ئەمه وەک فاکتەرێک بێسەروبەرییەکی له هاوسەنگی سیاسی تاکی کورد نابێتەوە.

لەرووی ئەمنی کەسەکانیشەوە، هەڵبەته لەپاڵ فاکتەره دەرەکیەکانی کاریگەری لەسەر ئەمنی هەرێمی کوردستان و ستراتیژی ئەو پەیوەندیانەی لەمەولا ئەم هەرێمه به ناوەندو هەرێمەکانی دیکەی عیراق دەبەستێتەوە و شێوازی بەیەکەوە ژیانی کورد وەک نەتەوەی دووەمی سەرەکی له عیراق لەگەڵ عەرەب شەڕی ناوخۆ هەمیشه گورزی گەورە بووە بۆ توخمی ئینتیماو تا ئاستێک کاریگەری سەرەکی هەبووە له دروستکردنی حاڵەتێک لەبێ ئومێدی بەرامبەر به ئایندەی تاک و کۆمەڵ و ناوچەکەمان. شەڕی ناوخۆ هەمیشه ئەو کارەساته مەزنه بووە هەردەم ئینتیمای بردۆتەوە نێو جغزو قەواره بچوکەکان و نەک ئینتیما یوتوپیه کوردستانیەکەی شێواندووە بگره له هەرێمیشدا چەندین نیشتیمانۆکەی لێ کەوتۆتەوە که ئینتیما لەو نیشتیمانۆکانەدا لەسەر بنچینەی ئینتیما بۆ حزبەو پلەی هاووڵاتیبوون لەسەر ئەم بنەمایه دادەمەزرێ. دواتر لەونبوونی ژینگەو زەمینەیەکی پڕاو پڕ له ورووژاندنی ئینتیما بۆ کوردستان نیشتیمانپەروەری دەبێ به بابەتێک بۆ لاشعورو بیرچوونەوە. بێگومان ئەمڕۆ هەلو مەرجی سیاسی و دیبلوماسی نێودەوڵەتی بۆ ئەوە له باره کورد پڕۆژەی نەتەوەیی خۆی گەڵاڵه بکاو بۆ ئەمەش ئەو کەشه ئیجابیەی له لێک حاڵیبوون له نێوان هێزه سەرەکیەکان هەیه زەمینەیەکی باشی پڕۆژەیەکی لەو بابەته دەبێ.

له پڕۆژەی کولتوری نەتەوەییدا ناوەندێک پێکدێ بۆ دەسەڵاتێکی یەکگرتوو، بۆ رای گشتی نەتەوەیی، بۆ گفتوگۆ لەگەڵ دەرەوە، لەپاڵ ئەمانەدا کەناڵی جیاجیا پێکدێن بۆ پەروەردەی نەتەوەیی و نیشتیمانی و ئەوسا دەکرێ ئیش بۆ هاوسەنگکردنەوەی عەیارەکانی ئینتیمای نیشتیمانی و گیانی نیشتیمانپەروەری بکرێ. هەڵبەته زیاد له (١٥)ساڵ دەبێ ورێک لەوکاتەی جەمسەری خۆرهەڵات ئەما هەردوو شەپۆلی دیموکراسی و کولتوری نەتەوەگەرایی بەیەک ئاراسته له هەڵچووندان و هەر بۆیه باشترین ڕێگا بۆ دیموکراسی، بڕیاردانه له دەرخستنی شەفافیەتێکی ئیداری و سیاسی لەچوارچێوەی پێکهێنانی دەسەڵاتێکی یەکگرتوو بەروحیەتێکی نوێی نەتەوەیی نا شۆڤێنی،ئەم دەسەڵاته رێز بۆ کەسی کوردی بگێڕێتەوە و هەمیشه له چوارچێوەی ئیرادەی دەستەجەمعی نەتەوەدا هەنگاو بۆ پێشەوە بنێ. ئەوسا نیشتیمانپەروەری دەبێتەوە ئەڵقەیەکی بەهێزی ئینتیماو لەهەموو ئەڵقەکانی دیکەی ئینتیما پتەوتر دەبێ.

# پەیامێک
# بۆ کار بەدەستی وڵات

**د.ناجی تکریتی**

**و/ بەدەستکارییەوە: مێرگ**



پێویست بەوە ناکات وەسفی حاڵەتی ئاشتیت بۆ بکەم، لەو بڕوایەشدام کە جەنابت باش دەزانیت کە چ خێر و خۆشی و حەسانەوەیەک لە بارودۆخی ئاشتیدایە، چونکە باشترین نیعمەتە لە دوای لەشساغی، مایەی بەختەوەرییە کە ئاڵای ئاشتی بەسەر کۆمەڵگەی وڵاتەکەتدا بشەکێتەوە.

هەڵوێستم بەرامبەر بە جەنگ، روون و ئاشکرایە، من دژی شەڕم بە هەموو حاڵەتەکانیەوە، چونکە شەڕ کارەساتە و مەرگەساتە، مەینەتی و ماڵوێرانی و دەربەدەری و قوڕبەسەری و هەموو جۆرە دارِمانێکی بەدواوەیە.

شتێکیّ ئاساییە ئەگەر وڵاتەکەت سوپایەکی سەربازی دابمەزرێنیّ، بەڵام دەبیّ سوپایەکی بەهێز و بەگوڕبێت بۆ بەرگریکردن لە سەروەری و سەربەخۆیی وڵاتەکەت و پاراستنی سنوورەکان لە هەر جۆرە هێرشێکی ناحەزان و دوژمنانە.

من پێموایە مەبەست لە دامەزراندنی سوپا، بۆ پارێزگاری ئاسایشی ناوەوەی وڵاتە و پاراستنی وڵاتە لە هەموو هێرشێکی دەرەکی، بۆیە هەر لێرەوە حەز دەکەم ئەوەشت پیّ بڵێم کەوا لە بەرژەوەندیتدانییە بەهەر بڕوبیانوویەک بێت هێرش بکەیتە سەر وڵاتێکی دی.

وڵاتەکەت سەروەت و سامانێکی سروشتی لەبن نەهاتووی هەیە، ئاوێکی زۆری هەیە، دەروازەکانی لە هەموو لایەکدا بەیەک دەگەنەوە و تۆکمەیی و یەکپارچەیی خۆی دەپارێزیّ.

رەنگە هەندێ جار ناچار بکرێی لەگەڵ وڵاتێکی دراوسێت رووبەڕوو ببیەوە و حاڵەتی جەنگ رابگەینیت، یان وڵاتێکی دراوسێت شەڕت پێ دەفرۆشێت، یان هەندێ جار ناچارت دەکەن وەک هاوپەیمان لەگەڵ وڵاتێکی دی بکەویە شەڕێکی خۆنەویستانە، لەم حاڵەتانەدا دەبێ زۆر وریا و ئاگادار و ورد بین و لەسەر خۆ بیت بۆ هەڵوێست وەرگرتن و بڕیاردان، چونکە رەنگە زۆر هۆکارو رێگەی گونجاوی دی هەبن لە شەڕت دووربخەنەوە، یان ناوبژیوان هەبێت بۆ جێگیرکردنی ئاشتی و پیادەکردنی ئاشتەوایی و نەکەوتنە ناو زەلکاوی جەنگ و بەرەنگار بوونەوەی چەکداری.

بەڵام دەبێ ئەوەش بزانیت کەوا شەڕی پارێزگاری کردن لەسنووری وڵاتەکەت و پاراستنی سەروەت و سامانی وڵاتەکەت و کەرامەت و شەرافەتی هاوڵاتیانت ئەمەیان دەکەوێتە خانەی بەرگریکردن، نەک شەڕفرۆشتن، لەو حاڵەتەشدا دەبێ وریا بیت و دوژمنی خۆت باش بناسی، دەبێ بەقەد توانای خۆت هەڵوێست وەربگری.



ئایا میللەتەکەت یەک ریزو یەک هەست و یەک بڕوان؟ پرسیارێکەو رەنگە زۆر بیری لێ نەکرێتەوە، بەڵام گرینگی و بایەخی خۆیشی هەیە، چونکە تۆ ناتوانیت سوپایەک بەرەو پارێزگاری لە وڵاتەکەت بۆ بەرەی جەنگ بەرێ بکەیت، لە حاڵەتێکدا کۆمەڵگەکەش ت لە ناوەوەدا دارزاو و پچڕپچ... یەکدیگرنەبن!

تۆ دەبێ لە رووی دەروونییەوە لە ... کۆمەڵگەیە بکۆڵیتەوە کە سوپایەکەی هێر... دەکاتە سەر وڵاتەکەت؟ هەروەها ئەو کەسە... کە سەرکردایەتی ئەم سوپایە دەکات، ئا... لەلایەن گەل و سوپاکەیەوە خۆشەویستە؟ ئا... بەتەواوی نوێنەری راستەقینەی میللەتەکە... خۆیەتی؟ ئایا جێی متمانەی میللەتەکەیەتی ... دڵسۆزە لەگەڵیان؟ ئەمانە شتی زۆر گرنگن... دەبێ پەندو ئامۆژگاریان لێ وەربگریت ... بیانکەیت بە بنەما بۆ هەڵوێست وەرگرتن ... بڕیاردان! چونکە زۆر جاران ئەم زانیاریان... دەبنە مایە و پێشەکیەکی گرنگ بۆ وەدەست... هێنانی سەرکەوتن، یان سەرنەکەوتن، و... ئەنجام و ئامانجەکان.

زۆر بە پارێز و ئاگادارییەوە لەگەڵ وڵاتانی دراوسێت رەفتار بکە، هەروەها لە نیاز خراپی... و چاو تێبڕینیان لە خێروبێرتان ئاگادار... وریابە.

تۆ دەزانیت کەوا زۆر جاران گرفتی سنو... لەگەڵ وڵاتانی دراوسێت دێتە پێش، لێرە... وەکو دەرزێک وڵاتانی دی دەتوانن سوودی لێ وەربگرن بۆ گەیشتن بە مەرام و ئامانجەکانی خۆیان.

زۆر وشیار و ئاگادار بە لەوەی کەو... کەسانی مشەخۆر و بەکرێگیراو و دوورو... بەتایبەتی ئەوانەی لە دەرەوەی وڵاتەوە... نەخزێنە ناو ریزی سوپای نیشتمانی، چونکە ئەم جۆرە کەسانە زۆر لە خەمی وڵاتەکەتد... نینەو لەگەڵ یەکەم تەقەی پێکداداندا، مەیدا... چۆڵ دەکەن و هەڵدێن و پشتت تێ دەکە... بۆیە دەبێ لە خۆت بپرسی: ئایا ئەوەندەت لەباردایە پشت بە تواناو هێزی خودی خۆت ببەستی؟ ئەگەر شەڕ رووی دا، رەنگە درێژ...

بکێشیێ؟ لەوانەشە کورت بێت، چونکە زۆر جاران لە کاتی شەڕدا جڵەو لەدەست دەردەچێ و بڕیارەکان لەناو جەرگەی مەیدانی شەڕدا دەردەچن! بۆیە دەبێ بایی ئەوەندە کەرستەو کەلوپەلی خۆراک و چەک و تفاقی جەنگیت داکردبێت، تا بتوانی بەرگەی درێژ بوونەوەی شەڕەکە بگریت و میللەتەکەت تووشی نەهامەتی و مەرگەساتی و قات و قڕی نەبێت! ئەمە نەک هەر تەنیا لە حاڵەتی شەڕدا، بەڵکو دەبێ لە حاڵەتی ئاشتیشدا ژیانی هاووڵاتیانی خۆت دابین بکەیت و بە تەنگ گیروگرفتەکانیانەوە بچیت.

باش بزانە ئەگەر تۆ وەکو سەرکردە و رابەر لە حاڵەتی ئاشتیدا ژیانی هاووڵاتیانی خۆتت خۆش نەکرد، مەحاڵە لە حاڵەتی رووبەڕوو بوونەوە و شەڕدا بتوانیت حاڵیان خۆش بکەیت، یان داوای پشتگیری و بەرگریان لێ بکەیت.

جۆری چەک و تفاقی جەنگی و چەندایەتیش رۆڵی کاریگەریان دەبێ لە یەکلاکردنەوەی جەنگ و بەدیهێنانی سەرکەوتن، یان ژێر کەوتن.

ئەوروپییەکان لە میانەی چوار سەدەی رابردوودا بە هێز و پشتیوانی باروودو چەکی کوشندە، توانیان غەزووی کیشوەرەکان بکەن و بەسەر دانیشتووانە سەرەکییەکاندا زاڵ بن، ئێستاش چەک و تفاقی جەنگی لەو پەڕی پێشکەوتندایە و کەرستەکانی وێرانکردن زۆر لەکەرستەکانی بنیاتنان بەهێزترن، لەگەڵ ئەوەشدا هەڵبژاردنی سەرکردەو رابەری بە توانا و لێهاتوو و راستگۆ و دڵسۆز، زۆر پێویستن بۆ پاراستنی ئاسایشی وڵات و پارێزگاریکردن لە سەرو ماڵی هاووڵاتیان، سەرکردەی راستگۆ، ئەو کەسەیە کە لە هەموو بارودۆخەکاندا لەگەڵتدا راستگۆو دڵسۆز بێت و لە رۆژە تاڵ و ناخۆشەکان و پڕ مەینەتیەکان بتوانێ پشتت بگرێ و بارت راست بکاتەوە.

لێرەدا بە پێویستی دەزانم ئەوەت بیر بخەمەوە کەوا چەندی دەتوانی دڵی هاووڵاتیانی خۆت راگرە و لە خۆتیانی رازی بکە، بەهەر کلۆج و رێگایەکەوە بێت، چونکە ئەگەر گەل و میللەت هاوکارو پشت و پەنات بوو، بڕوابکە هیچ دوژمنێک دەستی بەسەرتدا ناشکێ و تۆش بێ ترس و بێ منەت میللەتەکەی خۆت چەکدار دەکەیت و بەو پەڕی دڵنیاییەوە پشتیان پێ دەبەستی لەبەرگریکردن لە تۆو لە خاک و وڵاتەکەیان، دوژمنانت لێ وەدوور دەخەنەوە و بەسەریاندا زاڵ دەبن.

حەز دەکەم ئەوەشت بیر بخەمەوە کەوا هەر تاکێک لە میللەتەکەت لە مەیدانی شەڕدا بکوژرێ، خێزانێک، دایکێک، باوکێک، برایەک، خوشکێک... کەسێک لە دوای خۆی بە جێ دەهێڵێت، رەنگە کەسی دیکەیان لەو زیاتر نەبێت بۆ سەرپەرشتی و پەیدا کردنی بژێویان ئەوکەسەی وەکو زیانی جەنگ لە مەیدانی جەنگدا دەڕوات،

دەکرێ لەکاتی ئاشتەواییدا، رۆڵی خۆی لە بنیاتنان و ئاوەدانکردنەوەی وڵاتدا ببینێ!

لە کۆتایی ئەم نامەیەدا، داوات لێ دەکەم وەکو چیایەکی سەرکەش و سەر بڵند بەو پەڕی دڵسۆزی و تواناوە دژی هەموو شەرفرۆشێک و ستەمکارێک بوەستێ کە چاوی بڕیوەتە خێرو بێری وڵاتەکەت، چونکە نەمان باشترە لە ژیانی ژێر دەستەیی و خۆ بەدەستەوەدان.

**سەرچاوە: (الزمان- الف یاء) ژمارە (٢١٦٩)، ٢٠٠٥/٧/٢٤**

# کانی

## هەڵقوڵانێکی مۆسیقی بە ئاوێکی سازگارەوە

نڤان تەوفیق/دهۆک



وەکو دیارە هەر گوندێک لە ناوچەکانی ئێمەدا چەندین کانی لێیە، چ لەناو گوندی بێت چ لەناو زەویەکانی، کانی هەر گوندێکیش یان هەر ناوچەیەک لە(سووکی، ساردی، شیرینی، گەرمی،گرانی) وەک یەک نین، ئەوەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە چەند جۆرە کانییەک هەیە وەکو کانی ( ئەیر فاسی و لور فاسی) کە ئاوی ئەو کانیانە بۆ خواردنەوە گرانە، جۆری دووەمیش بە کانی (لامیستون) دەناسرێت، جۆری ئەو کانییە لە دەڤەری ئێمەدا زۆرن و باشترین ئاوی خواردنەوەن و دەغڵ و دانیش لەبەر ئەو جۆرە ئاوە دەچینرێت و بە داهاتێکی باش دەژمێردرێت.

بۆ نموونە ئاوی کانی (بامەڕنێ) لە قووڵایی چیای (مەتین)وە لەسەر کانی گەورەی (بامەرنێ) دامەزراوە...

جۆری سێیەم کانیاوەکانی (شرانش) ئەو جۆرە کانیە بەجۆری سازگار دەناسرێت و نزیکی کانی (لایمستونن)بۆ خواردنەوە بەکاریان دێنن وەکو (کانو دیرا)لە ناوچەی ئامێدی.

جۆری چوارەم:کانیاوی (کولوشن) لەو جۆرە کانییەدا بەشێکی زۆری کانزای کبریتی تێدایە، هەندێک لەو کانیانە ساردن هەندێکیشیان گەرمن،وەکو کانی (گەرماڤا)لە نزیک گەلی دهۆک، هەروەها کانی ستوکورکێ.

جۆری پێنجەم لەو جۆرە کانیە، کانییەکانی (بەختیاری)ە ئەوانەش لە ناو چەندین ئەرزەوە هەڵدەقوڵێن.

شایەنی ئاماژە پێکردنە، کە جێگای باش ولەبار هەیە ئەو پێنج جۆرە کانییەی لێ پەیدا دەبن، وەکو (کانی بەلاڤێ) لە نزیک (بانک و ئەرزا) کانیاوی بامەڕنێ و کانی چەمانکێ لە نزیک سیارو سپیندارا،کانی گەلی شێرانە لە دێرەلۆکێ و کانی ماسێ لە ناوچەی بەرواری بالا،کانی قەسارا لە رۆژئاوای شاری دهۆک،کانی دێرەبینێ لە زاخۆ، کانی بانیێ لە شکەفتێ دەردەکەوێت و چەندین کانیاوی دیکە لە ناوچەی زاخۆ، لە نزیک شرانش، هەروەها کانیاوی گەلی گەرەگو لە سەرسنگ و کانیاوی گەلی دیهییێ و کانیاوی سەر ئاشی لە سپینداریێ و کانی بلان و کانیاوی گوندی کسێ لە ئاکرێ و کانیاوی دینارتێ لە گوندی سەر ئاشکا. بەڵام سەیر لەوە دایە لە گوندی ستوکورکێ، جۆرە کانییەک هەیە کە هەردوو ماددەی (لامیستون و کولوش)ی تێدایە، هەردووکیان بەیەکەوە دەردەچن. کانی





خورپنییَ و کانی گەلی بازێ لە بارزان و کانی زێوا شەفیق و کانی رەشێ لە ژێر چیای مەتین...

پێش ئێستا بەرهەمی ئەو کانییە زۆر باشتر بوو، بەڵام ئێستا لە کەمبوونەوە دایە هۆکاری ئەوەش لەو خاڵانەی خوارەوە:

١- رێژەی بەفرو باران و تەزرە لە کەمبوونێکی بەرچاو دایە، وەکو ساڵانی رابردوو بەفرو و باران زۆر نییە، چونکە ئەوانە سەرچاوەیەکی سەرەکینە بۆ زۆر بوونی ئاوی کانیەکان.

٢- ئەگەر سەردەمانێک هەر گوندێک لە چەند خێزانێک پێک دەهات، ئەمرۆ هەر گوندێک بە رێژەیەکی فراوان خێزانی لێ



پەیدا بووە، ئەو ئاوەی ژێر زەویش بەشی بەکارهێنانیان ناکات.

٣- باشتر وایە رێگا لە ئاوی زستان بگیرێت و بۆ بەکارهێنانی هاوین (بەنداو)ی بۆ بکرێت.

٤- ئاوی هەموو کانییەکان لە ناوچەکان بەکار دێت، پاش ئەوەی کە پشکنینیان لەسەر دەکرێت. هەروەها لەناو ئاوی کانیاو ئەو جۆرە ماددانەی لێ پەیدا دەبێ وەکو (کالسیۆم،مەنگەنیس،کلۆرید، کبریت، صۆدیوم،پۆتاسیۆم،ماددەی ترشاتی و تفتی)و چەندین جۆری دیکە ئاو هەیە، چارەسازن بۆ هەندێ نەخۆشی وەکو ئاوی (گەرماقا)و ئاوی ستوکورکێ کە بۆ نەخۆشیەکانی پێست باشە، هەروەها ئاوی کانی باتیفا بۆ زەرتک بەکاردێ.

هەر وەکو دیارە لەسەردەمی رژێمی بەعس لە هەندێک ناوچەدا سەری هەندێ بیری ئاو و کانی بە چیمەنتۆ گیراوە، بەڵام لە هەندە شوێنی تر تەقاندوویانەوە

کانی سامانی میللەت دەژمێردرێت و سەرچاوەیەکی ئەگەری مان و بەردەوامی ژیانە.

# گەنج و پەیوەندییە خێزانییەکان لەبەردەم شەپۆلەکانی عەولەمەدا

د.مستەفا حیجازی

گەنج لە هەموو توێژەکانی دیکەی کۆمەڵگە زیاتر تێکەڵی گۆڕانکارییە خێراکانی ئەم گەردوونە دەبێ، چوون لە بنچینەدا جیهانگەرایی ئامانج لەوان دەگرێ و هەر ئەوان بەسەرمایەی سەرەکی خۆی دەزانێ و زیاتریش عەولەمە بە شارستانیەتی گەنجان ناسراوە و پشتی ئەو دیاردە جیهانیە تازەیە بە شوورو حەماسەتی ئەوان ئەستوورە و چیدی توانا و زانیاری پیرەکان سەرچاوەی سەرەکی و چوارچێوەی سەرەکی هەڵهێنجانی پلانەکانی دوارۆژنییە.

ئەم تەرەفگیریە ناچێتە قالبی ململانێی کلاسیکی نەوەکان بەقەد ئەوەی لەمەولا گەنج دەچێتە نێو کۆجیتۆیەکی تازەو ئەویش (گەنج بوونێکی سەرەکیە لە عەولەمەدا).

هەموو ئەو پێشهات و دیاردە نوێیانە دابڕانێک لە ڕووی زەمەن و لە ڕووی قۆناغەکانی گەشەی مرۆڤایەتیەوە دێنێتە پێش و بەڕاست کاریگەریەکانیان لەسەر گەنجان و لەسەر خێزان و پەیوەندییە خێزانیەکان ڕەنگ دەداتەوە و دەمانگەێنێتە ئەو پرسیارانەی بڵێین: چین ئەو پەیوەندی و کاریگەری و ڕۆڵانەی هەلی جۆراوجۆر بۆ گەنج دەڕەخسێنن بۆ ئەوەی میکانیزمەکانی بەرگری دەروونی و شێوازەکانی ڕەفتار لە خێزان فەراهەم بکا ؟.



خودی ئەم دیاردەی عەولەمەیە بەناچاری وا لە کۆمەڵگەکانمان دەکا بیر لە شێوازی دیکە لە (بە کۆمەڵایەتی بوونSocialization ) بکاتەوە بگونجێ لەگەڵ بینینمان بۆ دوا ڕۆژ و ئاییندەی خۆمان.

لە دوو خاڵدا دەتوانین بیروهزرەکانمان بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو دیاردەیە بخەینەڕوو.

**یەکەمیان:گەنج و عەولەمە و وەرچەرخانە خێزانیەکان:**

ئەمەیان شوێنگەی گەنجان لە نێوان عەولەمەو تایبەتمەندی و

خەسڵەتەکانی وەدیار دەخاو لەلایەکی دیکەشەوە دەچێتە سەر ئەرکە تازەکانی خێزان و پەیوەندیەکانی لەمەولای خێزان لەگەڵ گەنجاندا.

کەواتە زیاد نارۆین ئەگەر پێمان وابێ ئەم دوولایەنە لەو ئان و ساتەدا ململانێی سەرەکیان لەسەر گەنجانە و عەولەمە بۆ هەل و هیواو ئاسۆکانی خۆی رایان دەکێشێ و خێزانیش دەکۆشێ بۆ ئەوەی پارێزگاری لە رۆڵەکانی خۆی بکا و هەمیشە لەپەیوەندیدا بێ لەگەڵیاندا و بە ئاگاداریەوە هەلی سوود وەرگرتنی گەنجان لە عەولەمەش بۆیان بڕەخسێنێ.

ئایا لەمەولا خێزان رۆڵە گەنجەکانی خۆی دەداتە دەست قەدەری عەولەمە یاخود لە هەوڵی ئەوەدا دەبێ هەلومەرجەکانی عەولەمەیان بۆ وەدیهێنانی خودی خۆیان لێ زەوت بکا؟

لەمەولا شێوازی یارییەکان دەگۆڕێن و راستەوخۆ کاریگەری لەسەر شێوازی ژیان بەجێ دەهێڵن.

خێزانەکانی ئێمە دووچاری دوو فاقییەکی ناجێگیر بوونەتەوە و لە لایەکەوە پەیوەستن بە شێوە خێزانی درێژبووەوە وە لە لایەکی دیکە لەژێر کاریگەری شارستانیەتی خۆرئاوا بەرەو خێزانی ناوکی دەچن ئەگەر چی ئەم کاریگەریە رێک وەک خێزانی ناوکی خۆرئاوایی لێ نەکردووە.

خێزانی (ناوکی) خۆرئاوایی لە سۆنگەی فەلسەفەی تاکگەراییەوە پێکدێ و دەسەڵاتی



خزمایەتی هیچ کاریگەریەکی لەسەر رەوتی جولەی ئەم جۆرە خێزانە نییە، بەڵام خێزانی (ناوکی) خۆرهەڵاتی تا ئەو دەمەی بەرە هاوجووت بوون دەچێ لەگەڵ پارادایی خۆرئاوایی ئەوا لە هەر دوو شێوە خێزان (ناوکی،درێژبووەوە) بەر خورداره، وەک: لە رووی پەیوەندییەوە هێشتا لەژێر کاریگەری خێزانی(درێژبووەوە)دایە.

خێزانەکانی ئێمە لەم زەمەنەی ئێستاشدا سەربەخۆییەکی دەروونییان نەداوەتە تاکەکانیان و لە لایەکەوە دەستیان پێوەدەگرن بۆ ئەوەی لەژێر فەرمان و دەسەڵاتیان دەرنەچن لەلایەکی دیکەشەوە ناچارن دان بەو واقیعەدا بنێن کە عەولەمە ئامەدەیی بەرچاوی تیا هەیە، ئەمە لە کاتێکدا لە خێزانی (ناوکی) خۆرئاوایی هیچ جۆرە کێشەیەکی لەو بابەتە بوونی نییە چوون تاکەکان سەربەخۆو ئازادن.

هەڵبەتە عەولەمە رووی جیاجیا و دەرکەوتی جۆراوجۆری هەیە ئەم دیاردەیە سەرەرای کاریگەریەکانی لەسەر ئابووری، فەرهەنگ، بازرگانی... تاد کاریگەری دیاریشی لەسەر دەروونی تاکەکانی مرۆڤ هەیە دواتریش شێوازی پەیوەندیەکانیان بەجۆری تر دەگۆڕێ.

لەزەمەنی جیهانگیریدا سنورەکان لەبەرامبەر هێرشەکانی عەولەمەدا دەرمێن جیهانێکی ژمارەیی ئەلیکترۆنی دێتە ئارا کە بینینێکی تازەتری بۆ بوون و هەڵوێست لە خود و لە دنیا بە دواوەیە، لە نێو عەولەمەدا (شار)وەک بوونێکی جوگرافی، فەرهەنگی بە شێوازێکی دیکە لەشار دەگۆڕێ، گەنجەکان چیدی لەنێو شارەکانی خۆیان لەگەڵ هەراو هوریاو هێما کلاسیکیەکانی شاردا ناژین لەمەولا شار لای گەنجان شاشەی کۆمپیوتەری بەستراوەیە بە تۆڕی ئەنتەرنێتەوە، ئەمەیە دەرکەوتە تازە و پڕ مەترسیەکە، بوونی ئەنتەرنێت بە مەرجەعیەتی گەنجان و وجودی خێزان و باوک و دایکان وەک سەرچاوەی

پەروەردە و ڕێنمایی دەخاتە بەردەم مەترسیەکی گەورەوە.

عەولەمە لەڕێگای تەکنۆلۆژیای گەیاندن و ڕاگەیاندن بەرەو ئەو ئاراستەیە دەچێ کە پەیوەندیەکانی کارو کوڕ و کچ و ژیانی خێزانی و کۆمەڵایەتی دەگۆڕێ و بوار ئەوەندە فراوان دەکا لەبەردەمی گەنجان دنیا هەمووی بە درێژی و پانی خۆی ببێ بەمەیدانی جولەو چالاکیەکان و ئەو زەمەنە ڕۆیشت باب و باپیران ببن بە سەرچاوەی مەرجەعیی گەشەیان.



**دووەم: کاریگەری عەولەمە لەسەر پەیوەندی نێوان باوان و نەوەکان:**

دەبێ دیارترین ڕەنگدانەوەکانی ئەم شارستانیەتە لەسەر پەیوەنیدییە خێزانیەکان و لەسەر گەنجەکان چی بێ؟

ئەمەیان کێشەیەکی گرنگە و پێویستە هەندێ لەسەری بوەستین چوون دیارترین توخمە بە جموجۆڵەکانی ئەم زەمەن و قۆناغە گەنجانن و ئەوەتا مرۆڤە بەهێزەکانی بۆرسە و قارەمانەکانی دنیای پوول و دراو ئەنتەرنێت لە گەنجانن و زۆربەی زۆری ئەوانەی ژمارە پێوانەییەکان دەشکێنن لەوانن.

ئەم شارستانیەتەی ئێستا لە هەڕەتی گەشەی خۆیدایە بە شارستانیەتی گەنجان بەناوبانگە چوون ئامادەگی گەنجان لە هەموو بوارەکانی ژیان لە لوتکەدایە.

کەواتە گۆڕینی مەرجەعیەت لە خێزانەوە بۆ عەولەمە و ئەنتەرنێت لەلایەن گەنجانەوە خەریکە لەم زەمەنەدا بەرەواژوو دەبێتەوەو گەنجان دەبن بە سەرچاوە و مەرجەع بۆ نەوە کۆنەکەمان و ئەوان واتە لاوەکان بۆ چارەسەری کێشەکانی خۆیان پەنا بۆ شاشەکانی ئەنتەرنێت دەبەن و پەیوەندیەکانی نێوان باوان لەگەڵ منالەکانیان لە ستوونیەوە بەرەو ئاسۆیی دەچن بەمانا پەیوەندیەک لەسەربنچینەی هاوکاری و شەراکەت.

کەواتە شێوازێکی دیکە لەپەیوەندیە مرۆییەکان کە دیموکراسی تیایدا باوە سەرهەڵدەداو هەموو بەیەکەوە بەرەو پێکەوەنانی سیستمی دیکەن لە پەیوەندی ئینسانی، چەمکی ئینتیما لە گۆڕینی مەرجەعیەتی گەنجەکانەوە لە خێزانەوە بۆ شاشەکانی ئەنتەرنێت گۆڕانی ریشەیی بەسەردێ و وێب سایتەکانی ئەنتەرنێت دەبن بەو ماڵە شێمانەییانەی گەنجەکان پەنایان بۆ دەبەن و دنیاش بە هەموو فراوانی خۆیەوە دەبێتە ئەو مەیدانە بێ سنوورەی ئەوان تیایدا دێن و دەچن، کەواتە مەترسی سەرەکی لێرەوە دەبێ کاتێک گەنجان بە ئینتیما بۆ (ناشوێن) و (نامێژوو) پەیوەندی لەگەڵ عەولەمە دەگرن و تەنها نزیکەی (٢٠٪)ی گەنجان دەچنە نێو ئەم پەیوەندییە تازەیەو بەشە هەرە گەورەکەشی دووچاری بەتاڵی و پەراوێزبوون و بێ متمانەیی و پشت بەخۆ نەبەستن دەبنەوە، ئا لێرەشەوە مەترسی چوونە پاڵی گەنجان بۆ جولانەوە توندڕەوەکان و بوونیان بە کەرەستەی دەستی ئەوان و تێوەگلانیان لە مادە بێهۆشکەرەکان و چوونە دەرەوەیان لە تەقالیدو عورفە باوەکان دەبێ بە مەترسی سەرەکی لەسەر گەنج و ئایندەکەیان.

**تێبینی:**

ئەم بابەتە لە کتێبی (علم النفس و العولمە) وەرگێڕدراوە

**و.مێرگ.**




# دەستوور... کولتورێکی تازە

**پ.د.قاسم حوسێن سالح**

چیدی لەمەولا رۆشنبیریی هەر خوێندن و نووسین نییە و رۆشنبیریش ئەو کەسە نیە کە لە بوارە مەعریفی و ئەدەبی و هونەری و سیاسیەکان دەخوێنێتەوە.

رۆشنبیریی لە بنچینەدا بریتیە لە: مەعریفە و عەقیدە و ئاکارو یاساو زمان و نەریت و هونەرو سروتەکان....) کە لە نێو خودی تاکدا کارلێک دەکاو بە رەفتارێک گوزارشت لە خۆی دەکا.

مەعریفە شێوازێکی گوزارشت کردنە لە بریارەکان و رێگاکانی مامەڵە کردنمان لەگەڵ ئەوی تر. بەمانا ئەوەی وا لە تاک دەکا رەفتاری لە تاکەکانی تر جیابێ، جۆری ئەو کولتورەیە کە هەڵگریەتی. لە لێکۆڵینەوەیەکی سۆسیۆلۆژیای کلاسیکیدا کە مارگرێت مید لە ساڵی **١٩٣٥** ئەنجامی دا دەرکەوت کە کولتور کار لەرەفتار دەکاو ئەو کولتورەی لەسەر ململانێ ئیش دەکا هانی رەفتاری دوژمنکارانە دەداو ئەوەش کە لەسەر لێبوردەیی دامەزراوە هانی رەفتاری هاوکاری و ئینسانی دەدا.

کەواتە کولتور میکانیزمی کۆنترۆڵی خۆی هەیەو لەلای خۆیەوە ئاراستەی رەفتارەکان دەکا هەروەک چۆن دیجیتاڵ کۆنترۆڵی کاری کۆمپیوتەر دەکا، ئەمەش بەو مانایەیە کەلەنێو خودی هەر یەکێکماندا (ناوەندێکی کۆنترۆڵی کولتوری) هەیە ئاراستەی رەفتارەکانمان و شێوازی مامەڵەمان لەگەڵ ئەوانی تر دەکا.

لەو روانگەیەوە دەکرێ بڵێین ئایا دەستوور ج رۆشنبیریەکی تازەی بۆ تاکی عێراقی هێناوەتە ئارا؟

دەستوور وای لە تاکی عێراقی کرد کە بە قووڵی لە بوون و واقیع و ئایندەی خۆیی و تێگەیشتنی بۆ ژیان و رووداوەکان رامێنێ دوای ئەوەی کە بەدرێژایی زیاتر لە چواردە سەدە هزری ئەو لە رێگای چوار سیستمی سیاسی عەقیدەتی ( ئەمەوی و عەباسی و عوسمانی و بەعسی) لە قالب درابوو هەر دەسەڵات بوو یاسای دادەنا ئەمری بە چاکەو نەهی لە خراپە دەکرد و رەعیەتیش جگە لە ملکەچی دەرچەی دیکەی نەبوو.

یەکەم جارە تاکی عیراقی بەخەبەر دێ و ئاو لە بیردانی مێژوویی خۆی دەداتەوە و خۆی وەبیردێتەوە کە چەند ستەم لێکراوو کەرامەت سەلبکراو بوو و ئەو چوار سیستمە بۆ زیاتر لە هەزار ساڵ رۆشنبیری ئەویان بەو هاوکێشەیە لە قالب دابوو!

(سادیی دەسەڵات، مازوشی مرۆڤ).

بەڵام ئەو فەرهەنگە تازەیە کە دەستوور هاوسەنگی بۆ ئەم هاوکێشەیە ناهاوسەنگە

دەگێرێتەوە و چەمکی دەسەڵات چیدی بە ڕیپێدراوێکی ئیلاهی نازانێ و گەیشتن پێشی چیدی لە ڕێگای کودەتاو شۆڕش و پشتاوپشتی و سامان و خزمایەتی یەوە نابێ، بەڵکو دەستاو دەست کردنی لە ڕێگای دەستوور دەبێ.

دەستووری تازە بەندو عیباراتی جوانی تیایە لەوانە!( گەلی عەرەبی عێراق بەشێکە ئۆمەتی عەرەبی) ئەمەش مانای یەکسانی لە ئینتیمای نەتەوەیی دەگەیەنێ و جوانترین شت لەو عیبارەیە ئەوەیە کە میکانیزمێکی دەروونی لەنێوخۆیدا هەڵدەگرێ گرێی ئیستیعلای نەتەوەیی لای عەرەب و گرێی حەسرەت و چەوسانەوەی نەتەوەییش لای تاکی کوردی دەکاتەوە، چوون چەندە تاکی عەرەبی بۆی هەیە سەربەرز بێ بە ئینتیمای بۆ نەتەوەی عەرەب ئەوەندەش بۆ کورد هەیە سەربەرز بێ بە ئینتیمای بۆ نەتەوەکەی خۆی.

دەستوور وەک ڕۆشنبیریەکی تازە پێدراوی سایکۆلۆژی و ڕەفتاریی زۆر گرنگی هەیە، پێشتر کورد بە شێوەیەک تەماشای دەسەڵاتی دەکرد کە سەرچاوەیەکی مەترسیە لەسەری و لە ڕاستیشدا هەروابوو، تاکی عەرەبیش بەشێوەیەک لە کوردی دەڕوانی کە دەیەوێ پارچەیەک لە جەستەی کاتەوە. بەڵام لەمەولا دەستوور ئەم کولتورە کلاسیکیە دەبێ ڕاستکاتەوە و هەرچی خۆیەکەم زانین هەیە نابێ لەدوو توێی دابێ.

یەکەم جاریشە عەقلی عێراقی بە چەمکێکی دیکە ئاشنا دەبێ کە (فیدرالیە)و لای ئێمەی سایکۆلۆژیست ئاشکرایە کە عەقلی مرۆڤ لەسەر چەند بونیادێک **Constructions** پێک دێ و سیستمی ئەو بونیادانە بەدوو شێوە دەبێ: یەکێکی (وشک) و ئەویتری( نیان)، هەربۆیە دەبینین خاوەن سیستمی مەعریفی نەرم و نیان **Flexible** ئەم چەمکە دەستووریە تازەیە(فیدرالیەت) قبوڵ دەکەن، بەڵام عەقڵ وشکەکان پێی ڕازی نین.

بەڵام کاتێک دەستوور لای خەڵک وای لێ دێ کە پەیمانێکی کۆمەڵایەتیەو پەیوەندی نێوان دەسەڵات و تاک ڕێک دەخاو ڕێگا لە توندو تیژی و دەسەڵاتی دکتاتۆری ڕەها دەگرێ و بە فیعلیش دەبینن کە ئیدی خەڵکە لەمەولا سەرچاوەی هەموو دەسەڵاتەکان، ئاینیش چیدی ئەداتێک نیە بەدەست دەسەڵاتدارانی لە جۆری (عەبدوڵلای موئمین...!هتد)و خەڵکی عێراق لە ١٥ /٢٠٠٥/١٠ سەرەتایەکی دیکە بۆ مێژوویەکی تازە تۆمار دەکەن.



**دەستووری تازە بەندو عیباراتی جوانی تیایە لەوانە!( گەلی عەرەبی عێراق بەشێکە ئۆمەتی عەرەبی) ئەمەش مانای یەکسانی لە ئینتیمای نەتەوەیی دەگەیەنێ و جوانترین شت لەو عیبارەیە ئەوەیە کە میکانیزمێکی دەروونی لەنێوخۆیدا هەڵدەگرێ گرێی ئیستیعلای نەتەوەیی لای عەرەب و گرێی حەسرەت و چەوسانەوەی نەتەوەییش لای تاکی کوردی دەکاتەوە**

تەزبێح ئامرازێکی دەستگێڕی کۆمەڵایەتی میللی و بەرچاوە،بازاڕی هەمیشە لە برەودایە، دەم و ساتی نییە، تەنیا درەنگی شەوان پشوو دەدات، نەگینا ڕۆژ تا ئێوارە لە دەستی گەنج و پیر لە گەڕاندایە، هاوڕێیەکی بێگیان و زیانە تا نەیگێڕی دەنگی نایە.

# تەزبێح

## ئەو ئامرازەی لە گەڕان ناکەوێ

ئەحمەد حەیران

بۆ ئاشنا بوون بە جیهانی ئەو ئامرازە کۆمەڵایەتییە بەر بڵاوە، لە جێگەی تەزبێح فرۆشان تەنیشت باخی شار چاومان بەیەک دوو تەزبێح فرۆش کەوت بەم شێوەیە بۆمان هاتنە ئاخاوتن..

*** سەید خالید ئەحمەد، کاک سەید خەڵکی کوێی؟**

-: خەڵکی هەولێرم باب و باپیرم لە هەولێر بووە، گەڕەکی عارەبان بەناوی باپیری من داندرایە، لە پشت کەرکووکێ گوندەکانی کەتاحیەو ئەبو سەبیح و حەسارو حەویجە، سەید و شێخ بوونە لەوێ هاتوونەتە هەولێر،گەڕەکی عارەبان نەبووە، لەوێ ساکن بوونە، نانەوا بوونە، ئیتر بوویتە گەڕەکی عارەبان.

*** لەمێژە کاری تەزبێح فرۆشی دەکەی؟**

-: لە سالی (١٩٧٤)ەوە، پێش هەینێ ، تەزبێح فرۆش نەبووم لە مەرەقی تەزبێح بوومە تەزبێح فرۆش، زەوق و ئارەزوویەکە،کو پیاو هەیە مەرەقی کەوە یا کۆترە یا شتی ئەسەرییە یا سەیارە و جلکی جوانە، تەزبێحیش وایە،ئێمە ئیشەکەمان بەوانە هەیە کە مەرەقن، تەزبێحی جوان جوانم دەکڕی وەختی کە عادز دەبووم دەمفرۆشتەوە، فێرە ئەو کڕین و فرۆشتنە بووم

*** ناوی لەچی هاتووە؟**

-: تەزبێح بە تورکییە، بە کوردی هەر

تەزبێـــــحـــــە، عـــــارەب پێی دەڵێن(سبحه) ،ئێرانیش هەر دەڵێن تەزبیح

*** بنەچەی لە کێ هاتووە؟**

-: هەر نەوعـەکی لە جێـیـەکی هەیە، کـارەب لە ئەڵمانیاو پۆڵۆنیا، ئەو کـارەبایە دارە، ماددەیەکی لچقاو دەردەدا دێتە خوارێ دەکـەوێتە ناو ئاوی دەریا، کلس دەکـا دەبتـە ئەو کارەبایە لە هەموویان گرانترە.

*** تەزبێح زیاتر بۆچی بەکاردێت؟**

-: لە کنەمـە لۆوەیە لە دەسـتی بگـێـڕن، هەیە زەوقی پێـدێ، شـێـخ و مـەلاکـان تەزبێـحـاتی پێدەکەن بۆ پاڕانەوە لە خـودای گـــەورەو ســـەلاوات لەســـەر رۆحی پێـغـەمـبـەر(د.خ) ،هەیە فـاتیـحـاو دوعـای دەخینی حساب دەکات، هەیە بۆ مەشغـول بوون و خەم بەرێکردن.

*** ئەو پیـاوە ناودارانەی تەزبێـحیـان زۆر دەکڕی و بەکار دەهێنا کێ بوون؟**

-: زۆربوون کـابرایەک مـەتعـەمی هەبوو ناوی حـاجی مـەجـیـد بوو، ئەوە زۆر مـەرەقی بوو، حاجی فـازڵ بەقاڵ ئەمری خودای کردییە، براکـانی حەیدەر مـوسـا ئاغـای وەکی رەشـۆو زۆرانی تر، پارەیان بە تەزبێـــحی باش دەدا نەک ئەوانەی ئێستا لە بازاڕ هەیە.

*** جۆرەکانی تەزبێح چەندە؟**

-: بیـــســت تا سی جـــۆری هەیە، ، سـەندەلووس، سـەندەلووس فـاییـەر، یوسـر، نێرجیل، کرمان، کارەب، عاج، شاخ، پیرۆزە، پلاستیک هتد.

*** لە کـوردەواری ئەوەی لە ولاتی خـۆمـان هەیەو بەرهەم دێت چییە؟**

-: کارەبا و کرمان بووە، سەندەلووس بووە دەیانکردە بازنی دەسـتی ژنان، یان ملوانکە لەگـەڵ زیو یاخـود (تاسی)سـەری قـەدیم، ئەوانەی ئێـسـتـا لە دەرێش هەیە لە ئەورووپا، زۆری هەیە لێرە چوویتە ئەوێ.

*** لە کـوردسـتـان چ مـاددەیەک لۆ تەزبێح بەکار دێت؟**

-: قـەزوان هی چیـای خۆمـانە ئەوە کرایتە





تەزبێــحــەکی چاک، بەدەمــچــە، باوی، چەقــەلە ،ناوکی خــۆخ، دەکــرێنە تەزبێح و دەفرۆشرێن.

*** هەیە لە ولاتی هیندەوە بۆ ئێرە بێت؟**

-: بەڵێ، نەرجیلە، یوسرە، مینا کارییە مــینای لەناو کــرایە، ئەوانە ئیــشی دەستن، هەیە لە ئەفغانستان و پاکستان دێ، تەزبێح هەیە لە ددانی فــیل یاخــود شــاخ دروست دەکرێ، ئەوانە زەخرەفەشی لێدەکەن ئەوجا دەیهێننە ئێرە

*** ئافــرەت تەزبێــحی تایبــەت بەخــۆی هەیە؟**

-: ئافرەت تەزبێحی پیاوان و هی خۆی هەر لە ملی دەکات وەک ملوانکە، ئەگەر باش باشەکە بێت، ئەوە هەر لەملی دەکەن. جۆری کارەباکە ئەوەی لەدەرێ مەرغووبە بە دەفتەر دۆلار دەکڕدرێ، ئافرەت لێرە لە ملیان یان لە دەستیان دەکەن، لۆ تەزبیحات بەکار نایێنی، ئیللا ئەگــەر ژنەکــانی خــۆمــان نەبێ بە تەمــەنەکــان، هی دار هەیە لە ملی دەکــەن و تەهلیلەی پێدەکەن

*** ئەو جۆرانەی لێرە دەچنە دەرەوە چنە؟**



-: کــارەبایە، کــرمــانە، یوسرە، نێرجیلە، ئەوانە هەموو لێرانە دەڕواتە دەرێ

*** ئەو تەزبێحانەی لێرانە هەنە نرخیان تا چەند دەڕوا؟**

-: تەزبێح هەیە بە وەزنە، وەزنی دەوێ بە دۆلار دەکرن بە دۆلار دەفرۆشن لەوانە کارەبا، کــرمــان، ئێــستــا کرمــان بەو ئاخیرەی غــرامی گەیشتە(٨)دۆلار

*** گرانترین تەزبێح کامەیەو نرخی چەندە؟**

-: کــارەبا گــرانتــرین تەزبێحــە ،غــرامی بە (١٥-١٠-٨)دۆلارە لە (٥)دۆلار کــەمــتــر نییە

*** هەرزانترین تەزبێح کامەیە؟**

-:ئەم پلاستیکانە هەرزانن.

*** کــامــەیان زۆر باوی هەیە، خــەڵک دەیکڕێ؟**

-: ئەوەی تەزبێح ناس بێ تەزبێــحی باش دەکــڕێ، گــوێ ناداتە پارەکــەی،بەعــام مامناوەندییەکەی دەکرن، چونکە لە خراپەکەی باشترە، باشەکەشی پێناکرێ ئەوەیە.

*** جوانکردن و رازاندنەوەی تەزبێح چۆنە؟**

-: لێــرە وەســتــا هەیە مــاددەی دەکــەنە تەزبێح وەستا سابیرە،وەستا مەجیدە، وەستا ئازادە ،ئەوانە ئێستــا تەزبێح دروست دەکەن لە هەولێــرێ،تەزبێحــێکی ناشــیرین بێ، چەرخی دەکەن جوانە بێ،ئێستا ئەوە سەددەفە دەنکی گەورەیە ،دەیکەنە تەزبێحــێکی (١٠١)دەنکی وردی جــــوان،دوو گـــــولــینــگی لۆ



دەرازێننەوە،هۆنانەوەی لۆ دەکەن،(مام عومەر)هەیە ئەوەتە لەناو تەزبێح فرۆشان هۆنانەوەی لۆ دەکا باشترین شێوە دەردەچێ.

*** تەزبێحە باشەکان سیفەتیان چییە، چەند کۆن بێت زیاتر دەبریقێتەوە یان رەنگییان نارِوا، چییە؟**

-: شەرت نییە، تەزبێحی باش هەیە رەنگی تەحەجور دەبێ وەکی بەردی لێدێت هەر ناینایسییەوە، بە شێوەی چەرخ کردن رەنگی جوان دەبێ، دوایی رەنگەکەی دەگۆرِێ بە رەنگی دی نایناسییەوە، نازانی ئەوە تەزبێحە.

*** ئەو تەزبێحانەی زوو رەنگیان دەرِوات کامەیە؟**

-: پلاستیکن، بۆیاغ دەکرێن، بۆیاغەکەش زوو بەرەدا هەرشتەک ئەگەر ئەساسی خۆی نەبێ، رەنگی خۆی نەبێ دەرِوا، بەس ئەوەی مەواد کیمیاوی نارِوا .

*** تەزبێح هەیە رەنگەکەی پیرۆزبێت وەکو چۆن مۆری شین لەسەر ئەنگوستیلە دایە؟**

-: بەڵێ، ئێستا ئەو تەزبێحە شینە ئەوە پیرۆزە،رەنگی خۆیتی رەنگەکی موبارەکە، ئەوانە بە ئەحجار کەریمە دەخیندرێنەوە، دەڵێن: سیفاتی وەی ئەوەیە ئەگەر لەناو ئەنگوستیلە بێت،یاخود وەکو تەزبێح لە دەستت بێت ئەوا بروسک لێت نادات.



*** ئەدی لە بۆ چاووزاری هەیە؟**

-: لۆ چاووزاری ئەنگوستیلە هەیە پێی دەڵێن:

(أم العين) سليمان أم العين، تەزبێح هەیە بەدەستی چاویان لۆ دروستکردیە ئەوە ئەساسی نییە، بەڵام تەزبێحی جوان هەیە دەڵێن موبارەکە ئەو (نێرجیلە) دەڵێن: هەموو پێغەمبەرەکان هەریەک و عەسایەکیان هەبووە نێرجیل، دەرێن لانکەکەی حەزرەتی عیسا نێرجیل بووە، واتە ئەو دارە موبارەکە، لە دەرێ باوی هەیە

*** ئەو رەنگانەی زۆر باون، بەزۆری چ رەنگێک دەرِوا؟**

-: تەزبێح ناس تەماشای رەنگی ناکات، بەس ماددەکەی دەوێ، ئەگەر جسن بێت باش بێت دەیکرِێ، عیلاقەی بە رەنگی نییە، تەزبێحێکی باش بی، زەرد بی،سوّر بی، تێکەڵ بێت، کەسک بێت، مۆر بێ لەکنەوی فەرقی نییە بەس مهم شتەکە چاک بی ئەو دەیکرِی.

هەر لەناو تەزبێح فرۆشەکان چاومان کەوت بە کاک **(رومێل هورمز لاوەندە)** دەڵێ:(٢٠)ساڵ دەبێ خەریکی تەزبێح فرۆشیم،کاک رۆمێل خەڵکی هەریرو باتاسە،لە دایک بووی (١٩٧٤)ە ئێستا لە هەولێرە

*** تەزبێح فرۆشە کۆنەکان کێ بوون؟**

-: قەدیمەکان ئەمانە بوون (مام عوسمان، مام وەلی، سەید خالید،مام وەهاب، مام غەریب، یوونس، مام کانەبی، کاک هیدایەت) لەوانە هەندێکی ماون، هەندێکیش ئەمری خوایان کردییە

*** ژمارەی دەنکەکانی تەزبێح چەند جۆریان هەیە؟**

-: لە یۆنان(١٧)دەنک هەیە، لە تورکیا(٣٣)دەنک هەیە لای خۆمان(١٠١،٦١،٥١،١٧،٣٣)هەیە تەمەندارەکان(١٠١)دەنک دکرن، گەنجەکان (٣٣)دەنک دەکرِن،



# هونەرمەندی کورد

**پێشەکی**

میللەتی کورد لە سەرەتای بوونیەوە تاکو ئەمڕۆ خاوەنی ئاواز و گورانی نەتەوەیی خۆی بووە و ئەو هونەرە جوانەیشی هەر ڕەنگدانەوەی ژیانی کۆمەڵەکەی و دەنگدانەوەی ئاوازی سروشتی نێو جەرگەی خاکەکەی بووە، هەر لە هاژەی بەفراوانی کوێستان و خوڕەی تاڤگەی قەدپاڵی کێوە بەرزەکانی و شڵپەی شەپۆلی جۆگە و رووبارە سارد و سازگارەکانی و لە رەی سروەی ڕەوەزە چیا بەرزەکان و چریکەی بولبولی نێو باخ و ڕەزان، تا تێکەڵ دەبن بە ترپەی پێی کچی نەشمیلان و ئاوازی لەنجەی شۆخ و شەنگ

و خورپەی دڵی ئاشقان و ناڵە و گریەی دڵدارە دڵسووتاوەکان.

ئەمانە هەموویان بوون بە چاوگ و هەوێنی ئاوازی گۆرانیی کوردی و هەستێکی ناسک و جۆششێکی گەرم و گوڕیان خستۆتە نێو دڵ و دەروونی سەرجەم رۆڵەی کورد بە گشتی و دەستەی خۆشخوان و گۆرانیبێژە هونەرمەندەکان بە تایبەتی. دەستەی گۆرانیبێژە بەهرەدارەکان لە رێگەی هەستی ناسکیان و توانستی هونەرییانەوە، توانیویانە ئاوازی خۆش و دڵکێش بخوڵقێنن و بە دەنگی زوڵاڵیان مێشکی گوێگرەکانیان مەست بکەن و مەقامی رەسەنی کوردی بچڕن و پشتاو پشت ئەو هونەرە رەسەنەمان بۆ بەجێبهێڵن و بە پێی دەورو قۆناغ لووس و لێکتری بکەن تا لەگەڵ چێژ و ئارەزووی خەڵکەکەدا بگونجێن و یەکێک لەو مەقامبێژە هونەرمەندانەی کورد کە جێ پەنجەی لە پەرە پێدانی مەقامی کوردیدا بووە، سێوەی مەقامبێژی هونەرمەندی کوردە.

**سێوەی مەقامبێژی هونەرمەندی کورد**

سێوەی مەقامبێژی هونەرمەندی کورد، ناوی تەواوی (صلیوە)ی کوڕی (یەلدە) کوڕی (صلیوە) بووە و لە شاری کۆیە دیانەکان بە (صلیوە) دەڵێن (سێوە) و ئەم زاتە لەساڵی ١٨٩١دا لە گەڕەکی بەفریقەندی کۆیە و لە ماڵێکی کووچەی دیانەکانی ئەو شارەدا لەدایکبووە. لەساڵی ١٩٠٢دا بۆ یەکەم جار لە لای قەشە حەننا خوێندوویەتی و لە ساڵەکانی ١٩٠٣و ١٩٠٤یشدا دەرسی زمانی سریانی و بنچینەکانی ئایینی مەسیحی لە لای (قەشە گۆرگیسی رەبەن) خوێندووە و لە ساڵی ١٩٠٥دا بۆ ماوەی دوو ساڵ لە لای (قەشە پۆلس عوجمایا)ی ناسراو بە (قەشە سوورە) خوێندنەکەی تەواو کردووە، لەبەر زیرەکی و زەین روونی بە ماوەی پێنج ساڵ بە چاکی فێری زمانی سریانی و سەرەتایەک لە زمانی یۆنانی و فەرەنسی بووە و لە خوێندنەکەیدا گەیشتۆتە پلەی (شەماشە) و لەو لاشەوە بە یارمەتی هەندێ لە دۆستە خوێندەوارەکانی بە باشی فێری خوێندنەوە و نووسینی کوردی و عەرەبی بووە.

لەتافی لاویدا ئاشقی (وارێ)ی کچی یووسف ناوێک دەبێ و بە عەشقی



**سێوە بە تەواوی بووەتە میراتگری مەقامزانەکانی کۆیە، بەڵام کت و مت هەمان رێبازی ئەوانی نەگرتووە بەڵکو خۆی بووەتە خاوەن رێبازێکی هونەری مەقامی رەسەنی کوردی**

ئەو کچە نازدارە هونەری مەقام و بەستەی کوردی لەلا دەخولقێ و ئاوازی مەقامی ڕەسەنی کوردی لە حەنیل و پووتێ و عەبەی چایەچی و ڕەفیق چارچاو فێردەبێ. بە عەشقی (واری)ی دۆستی ناسک و نازداری پەرە بە ئاوازەکانی ئەو مەقامانە دەدا، بە تایبەتی کە (واری)ی بە نسیب نابێ، ئەو مەقام و گۆرانییانەی پەردەیەکی خەماوییان بەسەردا هەڵدەکێشرێ، بە تایبەتی دوای مردنی (واری) کە بە نابە دڵی درایە خزمێکی خۆی و زۆری نەبرد بە نەخۆشی سیل سەری نایەوە.

سێوە بە تەواوی بووەتە میراتگری مەقامزانەکانی کۆیە، بەڵام کت و مت هەمان ڕێبازی ئەوانی نەگرتووە بەڵکو خۆی بووەتە خاوەن ڕێبازێکی هونەری مەقامی ڕەسەنی کوردی. دەنگێکی خۆش و قەبەی لەباری هەبوو، هەستێکی مۆسیقی ناسکی لەلا خولقابوو، بە هەوڵدانێکی کەم توانی خۆی بکاتە ئاشنای مۆسیقای ڕۆژهەڵاتی. لە کاتی گۆرانی گوتندا دەیزانی لە کوێ دەست پێ بکات و لە کوێش بوەستێ. بەند و ئاوازی مەقامەکانی لە سەرچاوەیەکی سازگاری کوردەوارییەوە هەڵقوڵابوون و بە زۆری لە گیرو گرفتەکانی لاوان و ئەڤین و ڕاستگۆیی و وەفاداری و سروشتی خاکی کوردستانەوە دەدەوێن و بەڕەگێکی قایم و قووڵ و بەناو بوون و ویژدانی میللەتدا چوونەتە خوارەوە و لە زۆر شوێندا لە بازنەی کات و ڕۆژگار دەچنە دەرەوە تاکو بۆ هەموو دەور و سەردەمێکی مرۆڤی کورد دەست بدەن، بۆیە مەقامەکانی سێوە بە گۆرانیی ڕەسەنی کوردی دەدرێنە قەڵەم.

هەر چەندە ئەو مەقامانەیشی بە دەقی ئەدەبی و ئاوازەکانیانەوە، ڕەگ و شادەمارەکانیان دەچنەوە سەر مەقامەکانی سەدەی نۆزدەم، بۆ سەردەمی ئەمین ئاغای حەویزی ناودار بە (ئەختەر)ی شاعیر و مەقامشووناس و، (مەڕیێن) و (ئەشئەتی ڕەشید ئاغا) کە مامۆستای مەقامی ڕەسەنی کوردی بوون بەڵام ئەم ڕاستییە ئەوە ناگەیەنێ کە مەقامەکانی سێوە بە ئاواز و دەقەوە کت و مت هەمان مەقامی ئەو سەردەمەی پێشوو بووبن و هیچ گۆڕانکارییەکیان بەسەردا نەهاتبێ و پەرەیان پێ نەدرابێ.

هەروەکو ئاشکرایە ئەدەب و هونەر و ڕووناکبیری ئاوێنەی باڵانمای ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی گەلانن و بە پێی قۆناغ و گۆڕانی باری ژیان، ئەوانیش دەگۆڕێن و گەشە دەکەن. لە سەرێکی تریشەوە سێوە خۆی مەقامبێژێکی هونەرمەندی بەدەستەڵات بوو، توانای داهێنانی ئاوازی نوێ و تازەکردنەوەی ئاوازی کۆنی هەبوو، بە زیادکردنی شتی تازە و لابردنی نەغمەی کۆنی سواو و نەگونجاو لەگەڵ بابەتی مەقامەکەدا. بۆیە لە کاتی گۆرانی گوتندا هەمیشە زاڵ بوو بەسەر ئاوازی مەقامەکانی دا و بە توانای هونەری خۆی دەسکاریی تێدادەکردن، بەبێ ئەوەی لە سنووری گشتی و بنەما سەرەکییەکانی ئەو مەقامانە دەربچێت.

### گەشتێک بەناو
### بەندی مەقامەکانی سێوە

سێوەی هونەرمەند بە دەیان مەقامی ڕەسەنی کوردی و بەستەی پڕجۆش و خرۆشی گوتووە. لە هەمووشیاندا بە چاکی سەرکەوتووە و بە کامی دڵ بەناو باخ و گولزاری ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی و شیعری کلاسیکی میللەتەکەی دا گەڕاوە چەپکێک گوڵی بۆنخۆش و ئاوداری چنیوە و کردوونی بە چمکێک مەقام و وەک دیارییەک پێشکێشی گوێگرانی کوردی کردووە. ئێستاش گەشتێک بەناو دەقی بەندی مەقامە ڕەسەنەکانی دا دەکەین، کە لە ساڵی ١٩٥٢دا

پێنج لەو مەقامانەی لە ئێستگەی رادیۆی کوردیی بەغدا تۆمار کردووە کە ئەمانەی خوارەوەن (مەقامی عەجەم: سەحەر) و (حیجاز: گوڕێ) و (بەیات: عایشە گوڵ) و (حیجاز: بوهار) لەگەڵ مەقامی (کراسی شەنگ مێرەم)دا و لێرەدا لە هەریەکەیان کۆپلەیەک بە نموونە دێنینەوە:

**١. مەقامی عەجەم: سەحەر**

گۆرانییەکی رەسەنی کوردییە، لەسەر ئاوازی عەجەم دەگوترێ، مەقامێکی شارستانییە و لە ژیانی پڕهات و باتی ناوشار و بازرگانیی سەردەمی کۆنی کوردەوارییەوە دەدوێ و دانەری دەقەکەی ئاگاداری کەلەپووری ئیسلام و سایکۆلۆژییەتی نەتەوەی کورد بووە و، تابلۆی شیعری جوان و وێنەی هونەریی ناسکی تێدا کێشاون:

**ئەوەل سەحەرە**
**سەحەر سەدای منی غەریبە ماری**
**وەزی هەر گێژم**
**ئەگەر فەقێیان لە مەدرەسان دەخوێنن**
**ئەمن بە بێ برین خوێنێ دەرێژم**
**گەلی برادەرینە ئەمن هەرچەندەی دەکەم**
**لەوێ کۆنە دنیایێ**
**قاسیدەکی بە متمانیم بە دەست ناکەوێ**
**بینێرمە کن بەژنێ باریک و دووچاوی بەرەک**
**راستی دری خۆمی لەبۆ ببێژم**
**وەیلێ سەحەرە!!**

**٢. مەقامی حیجاز: گوڕێ**

**ئەرێ گوڕێ گورە جوانێ**
**سینگ سپیێ مەمک فنجانێ**
**داک حدوودێ باب شاسەیوانێ.**
**خواکەی گوڕێ**
**ئەگەر جەللادان لەمن دەگرن چارگۆشەی مەیدانێ**
**چەرخەچی شا میسریان دەردێن لە کالانێ!**
**توعەشقی خودای بەوێ رۆژی جومعەیە**
**شەمووی بەسەر دادێ**
**ئەوان گرتیان بەردەوە لە بەندیخانێ!!**

**٣. مەقامی بەیات: عایشە گور**

**ئای ئای ئای ئای**
**ئەگەر سەرێ من دەیێشی**
**دری عایشێی بابان وێران ناسکەنی**
**لەبەر هەرامە زوگرتی**
**هەر کەسانەکی سوارە چووکەلانەکەی من ناناسی**
**ئەوەتانی قایمە و قایمەلانی خۆی**
**داوێتەوە چۆم و چۆمارو سۆرە کرتی!**

**لە کوپلەی دووەمیشدا وەسفی سوارە چووکەلانەکەی خۆی دەکات و دەڵێ:**
**عایشە گور دەرێ هەر کەسانەکەی**
**سوارە چووکەلانەکەی من ناناسی**
**ئەوەتانی سواری جوانە ماینەکی**
**بۆری ئەسعەد بەگی کەوێتە**
**لە لایەکی دەرۆن چووتەکی توولە و**
**لەوی دیکەشی جووتە تاژی مل بە قەرێتە!!**

**٤. مەقامی حیجاز: بوهار**

**ئەمن ئەوا بوهارەکم گەیوەتێ**
**گەلی برادەرینە**
**خواکەی سەرێ من دەیێشێ**
**دری منی غەریبە مارێ دەترسێ**
**ئەگەر سەرێ من دەبڕا ببیتن بە قوربانی**
**ئەوێ قورینگێ گەردن گۆزر**
**کە وەتانی هەموو بوهار و پایزان**
**شاپەرێ خۆی شۆڕ دەکاتەوە**
**بەسەر گۆل و گۆلاوی کاولە سندووسی!!**
ئاوازی ئەم مەقامەی بوهار لەهەموو مەقامەکانی

دیکەی غەماویترە.

**٥. مەقامی کراسی شەنگ مێرەم:**

ئەم مەقامە سەبارەت بە ناوهێنانی تفەنگی شەشخان، کە ئەو ساکە چاکترین تفەنگ بووە لە هەموو دەقەکانی مەقامەکانی سێوە نوێترە، زادەی ئاوو هەوایەکی شارستانێتی پڕ هات و باتی بازرگانی سەدەی نۆزدەمە، بابزانین تەتەر و دایکی شەنگ مێرەم چ گفتوگۆیەک دەکەن:

**تەتەر دێ و رادەبرێ**
**داکی شەنگێم دەرێ: (تەتەر مارت وێران بی**
**قیمەتی ئەو کراسەی لە بۆ من برێ)**
**تەتەر دەڵێ: (قیمەتی ئەو کراسەم ئەوەتانە**
**بە پێنج سەد بەردیلی بەر بەرانە!**
**بە پێنج سەد ماینی کەحیلانە!**
**بە پێنج سەد تفەنگی شەشخانە!**
**بە پێنج سەد هۆقە روونی تەیرانە!!)**
**داکی شەنگێم دەرێ:**
**(تەتەر مارت وێرانی بی**
**ئەگەر شەنگێ ئەو کراسەی**
**لەبەر بکات و بچێتە شایی و گۆوەند و سەیرانە**
**خەرکی بیبینن داخوا دەرێن**
**چتۆ کچەتیمە رەزەوانە!!)**

**مەقامەکانی سێوە لە تەرازووی رەسەنایەتیدا:**

بە کەمێک سەرنجدانی دەقی بەند و بەیتەکانی مەقامەکانی سێوەی هونەرمەند و هەڵسەنگاندیان لە رووی ئەدەبی و هونەرییەوە ئەم راستییانەمان بۆ دەردەکەوێ:.

١. بابەتەکانی هەموویان لە کۆمەڵگای کوردەوە هەڵقوڵاون و بۆ کورد گوتراون. پڕن لە وشەی ناسکی خۆشەویستی و ئەڤین و دڵپاکی و ئازایەتی و سوارچاکی و وەفاداری و مەردایەتی و خۆبەختکردن.

٢. مەقامەکانی بە دەقی ئەدەبی و ئاوازەوە، لەناو ئاو و هەوایەکی سازگاری کوردستانەوە خولقاون، تۆمار و سیمفۆنیایەکی رووداوە کۆمەڵایەتی و سیاسی کۆمەڵی کوردەوارین و بە پێی قۆناغی ژیانی خەڵکەکە خولقاون.

٣. شاعیری میللی و فۆلکلۆریی بەیت و بەندەکانی لە دەربڕینی رەوانبێژیدا، بۆ دەرخستنی جوانیی ئافرەت، تا کارمامزی مل بە قەرێتە و قورینگی گەردن بەرز و سەقەری باڵەبان و کەوی وڵاتەکەی خۆی هەبووبێ، بە گیانەوەری دوورە وڵاتی وەک زەرافە و کەنگەر و تاوسی نەچواندووە.

٤. شاعیری دەقەکانی گۆرانی و مەقامەکانی لە پێیدا هەڵدانی هەر شتێک جوانترین و زیندووترین چەشن و ئەندامی هەڵبژاردووە. لە دەربڕینی جوانیی ئافرەتدا، کەوتووەتە وەسف کردنی ئەو ئەندامانەی کە دەبنە پێوانەی جوانی و شۆخ و شەنگی مێینە لەبەر چاوی نێرینەی جوانی پەرستدا، هەر لە بەژن و باڵای بەرز و سنگی سپی و مەمکی فنجانی و گەردەنی زەرد و چاوی بەڵەکەوە بگرە تاکو دەگاتە برژانگ و برۆی رەش و چاوی وەک چاوی سەقەری باڵەبان و دوگمەی سینە و مەمک و قۆڵ و باونجی کچی شۆخ و شەنگی کورد.

٥. دانەری ئەو دەقانە وەستایانە سوودیان لە گەلێ کەرستەی کەلەپووری ئایینی و نەتەوایەتی کورد وەرگرتووە. بەو کارەشیان قووڵبوونەوەیەکیان بە ناوەڕۆکی بابەتەکان داوە، هەروەک لە دەقی بەندەکانی مەقامی (سەحەر) و (گورێ) و (کراسی شەنگ مێرەم)دا بەکار هاتوون و رەسەنایەتییەکی پتەویان بە مەقامەکان داوە. لە (نەفخی سووری حەزرەتی ئیسرافیل) و (گفتوگۆی حەزرەتی مووسا لەگەڵ باری تەعالا) و گەلێک رەمز و نموونەی دیکەی وەک (مەنسووری هەلاج) لە ئایینی ئیسلام و رەمز و نموونە وەک (عەلی بەگی داسنی لە مەقامی شەنگ مێرەم)دا.

# دنیای مەقام و مەقامبێژان لە کەرکووک و گەرمەسێری گەرمیاندا

کەرکووک / وشیار ئەحمەد ئەسوەد



گەرمیان دەوڵەمەنترین دەڤەری کوردستانە لە بواری هونەری مەقام بەگشتی و مەقامە کوردیەکان بەتایبەتی...

تا ئاستێک لە بارەیەوە وتراوە و بەچەندان جۆر شی کراوەتەوە، بەڵام تاکو ئێستا لێکۆڵینەوە و شی کردنەوەیەکی زانستی لەم بارەیەوە نەکراوە، هاوکات فەرامۆشکردن، یان نەکردنی مەسحێکی مەیدانی بۆ گۆرانییە میللییەکانی ئەم شار و دەڤەرە، وای کردووە زۆرترین ڕێژەی ئاوازەکانمان بە جۆرێک تاڵان بکرێن، تەنانەت خۆمانیش بە ئاستەم بیانناسینەوە، کە خۆی لە تەعریب و تەتریک و تەفریسدا دەبینێتەوە، ئەم بێکەسییە وای کردووە تەنانەت هەندێک لە مەقامەکانیش بگرێتەوە وەک ئەوەی چەند مەقامێکی کوردی (دەشت بە فارسی ناوزەد دەکرێت، ئەو شارو مەسنەوی کراون بە عەرەبی و...و...زۆری دیکە)... وێڕای ئەمانەش زۆرێک لە مەقامەکان بە هۆی ئەستەمی گوتن و ئەدا کردنیانەوە، نەتوانراوە بشێوێنرێن، زیندووترینیشیان مەقامە کوردییە گەرمیانیەکانی وەک (قەتار و خاوکەر و

ئەللاوەیسی و ئەلوەن و ئای ئای و خورشیدی)ن... هەندێکی دیکەشیان هەوڵی تەعریبکردنیان دراوە وەک (مەسنەوی کراوە بە مپنوی) و (خەناباد کراوە بە خانة من البیات) و هی دیکەش.

وێڕای ئەم دەستدرێژی کردنەش، تاکو ئێستا مەقامە ڕەسەنەکانی گەرمیان بە دەوڵەمەندی ماونەتەوە، لێرەشدا پێم باشە بە زانیارییەکانی خۆم لەم بارەیەوە نەوەستم، بەڵکو خەڵکێکی دیکەی شارەزاو پسپۆڕی بوارەکە بدوێن بێگومان مەقامە کوردیەکانی ئەم دەڤەرە مێژوویەکی فرە دوورو کۆنی هەیە، بە جۆرێک تا ئێستا هیچ بەراوردێکیان بۆ دیاری نەکراوە، تەنها مەقامی (هیجران) نەبێت کە مەقام بێژی گەورە (عەلی مەردان) دایهێناوە و لە ناوەڕاستی پەنجاکان تۆماری کردووە، ئەویش لە ڕەگەزی مەقام سەرەکی (بەیات)ە.

وەک مەقامبێژ (عومەری حەمە درێژ) دەڵێت:

گەورەیی و ڕەسەنایەتی (هیجران) لەوێدایە کە تاکو ئێستا هیچ کەسێک نەیتوانیوە بە شعرێکی دیکە جگە لە (شەرتە تا ڕۆژی حەشر) ئەدای بکات.

کەواتە (هیجران)یش وەک مەقامێکی گەرمیانی دەناسرێ، ئەمەش بەو هۆیەی کە عەلی مەردان لەسەرجەم ئەو مەقامانەی تۆماری کردوون، نەیتوانیوە خۆی لە شێوازە گەرمیانیەکەی دەرباز بکات.

لێرەوە جێی خۆیەتی ئاماژە بەوە بکەین کە (تەکیێی تاڵەبانی لەکەرکووکدا گەورەترین قوتابخانەی مەقامە بەگشتی و مەقامە کوردیەکان بەتایبەتی) هاوکات قوتابخانە مەقامییەکەی تەکێ، کاریگەرترین فاکتەر بووە بۆ مانەوە و پاراستنی ئەو مەقامە کوردیانەی تاکو ئێستاش وەک خۆیان ماونەتەوە، لەبەر ئەوەی لە سەردەمی بەر لە دەسەڵاتی عوسمانییەکانیشەوە تاکو ئێستا لە کۆڕی مەقام و مەقام بێژان و پێگەیاندنیان دانەبڕاوە، کە لە هەفتەیەکدا دووشەو، بەتایبەتیش شەوانی هەینی، لەپاش کۆڕی زیکر و مەدحی دەروێشانی ئەهلی تەریقەت، کۆڕی مەقام و مەقامچڕین لەوێدا گەرم دەکرێ و ئەو هۆڵە لە مەقامبێژانی کەرکووک جمەی دێ.

نووری فەقێ کە لە دایکبووی (١٩٢٧-


حەمە درێژ


حوسێن عەلی


نوری باریکەی

کـەرکـووک)ە یەک لەو مەقامبێژ و کەسایەتییانەی کـەرکـووکـە، کـە لەلای کـەرکـووکـیـان وەک ئەرشیفێکی شەفەوی شارەکە ناسـراوە، ئێـمـەش هەر بە (خالۆ نووری) ناوی دەبەین، کەسێکە زۆر سەخی تەبیعەتە لە پێدانی زانیـاری، زۆریش وردو بە سـەلیـقـەیە، لەرادەبەدەر شـارەزایە لەمـەقـامـەکـانی کـوردی و عـەرەبی و تورکـمـانی و فـارسـیش، کـاتێکیش ئێمەومانان هەر شتێکمان لەو رووەوە لێ عـاسێ بێت، گـورج هانای بۆ دەبەین و ئەویش رەزیلیـمـان لێ ناکـات... کـاتێک چوومـە لای، پێمگوت: خالۆ نووری هەندێک زانیـاریم لەبارەی مەقامبێژە کۆنەکان پێویستە بۆ (گـۆڤـاری مـێـرگ) پێی گـوتم: (ئەگـەر مـەجـەلەکـە کوردییە، وەبان چاو).

خـالۆ نووری دەڵێت: ئەوەندەی من بزانم و لە باوک و باپیرانەوە بۆمان مابێتەوە، لە کەرکووکدا مەقامبێژەکانی تەکیێ تاڵەبانی مـەقـامیـان دەچڕی، لە سـەردەمی عووسمانییەکاندا باشترین مـەقـامبێژی ئەو سەردەمـە (مـەلا وەلی) بوو کـە دەکـاتە سـەردەمی (شـێخ عەبدولڕەحمـان خـالیسی) دوای ئەو ئەوجـا (عەبدولڕەحمان شلتاخ) پەیدابووە کە ئەویش خەڵکی کفرییە و هەر لە (مەلا وەلی) شەوە فێری مەقامەکان بووە و دواتر چۆتە بەغـدا و ناوی دایەوە و ناسـرا... لەپاش ئەوان (حەمە پیرە و محەمەد خەلیل ئاغا و حاجی نوعمان) پەیدا بوون ئەوانیش گـەلێ دەنگخـۆش و شـارەزابوون، تەنانەت(مزگەوتی نوعمان) لە کەرکووکدا بەناوی (حاجی نوعمـان)ەوە نراوە، چونکە لـەوێ بـانـگـدەر بـووە و تەنزیلەی گـوتووە... خـالۆ نووری دەیگوت: ئەمانە نەک تەنها مەقامە کوردییەکان، بەڵکو هەموو مەقامەکانیان بە کوردی و تورکی و عـەرەبی و فـارسی دەچڕی، تەنانەت (عـەلی مـەردان)یش باسی ئەوەی دەکرد کە بە منداڵی لە تەکیێ تاڵەبانیـدا گـوێی لە حەمە پیرە و خـالیـد ئاغـا و حـاجی نوعمـان گـرتووە و لەوانەوە چەندان مـەقـام فـێـر بووە، ئەمـەش دەگـەرێتەوە بۆ ساڵانی بیستـەکـان، چونکە ئەوکـاتە عەلی مەردان منداڵ بوو دەهاتە لای مەلا ساڵح لە تـەکیێ دەرسی قـورئـانی دەخـوێند... پاشـان لە دەوروبەری سـاڵی ١٩٣٨ (مەلا محەمەد تۆپەڵ) پەیدا بوو کـە زۆر مـەقـامبێژێکی


فائق داودە

بلیـــمـــەت بوو، پاشـــان (کەمال)ی کوڕی مەقامبێژ بوو ئێـســتــا نەمــاوە، بەڵام (وەجـدی کـوڕی کـەمــال) ئەویش مەقامبێژە و ئێستا لە (بیت المقام العراقي)یە، مەلا محەمەد تۆپەڵ خۆی کورد بوو و زەنگەنە بوو، بەڵام ئێستا نەوەکانی خۆیان بە تورکمان دەزانن، جگە لەوان هەر لەو سەردەمە (مەلا عەبدوڵڵای لۆبیاچی) هەبوو کە خەڵکی گەڕەکی قۆریەبوو، هەروەها (مەلا تۆ فیق) تورکمان بوو، ئەوانیش زۆر نـاســـــراوو شارەزابوون... پاشان (عەلی مەردان) هەر لە تەکیێ فێری مەقامەکان بوو، ئەوەبوو دواتر چووە بەغـــدا و لەوێ زیاتر گەشەی کرد... بەڵام خاڵۆ نووری دەڵێت: من دەزانم کە یەکەم کەس (عەبدی سەعە عـەربەتی) بوو کـە لەگـەڵ (مـەلا تەها) چووە بەغـداو لەو سـەردەمـەدا (شـەریکەی بەیزافـــۆن) هەبوو لەوێ مـەقـامی (ئەلڵا وەیسی) لەسەر قەوان تۆمارکرد کە شەریکەیەکی بەریتـانی بوو جگە لەوانەش لەو سەردەمەدا (حـەمـەی کـۆتره مل) هـەنـدێـکـیش دەڵـێـن (کۆتەرەمل) مەقامبێژێکی بە تـوانــابـوو، لـەنـاو ئاسنگەرەکانی کـەرکـووک چایخـانەی هەبوو، ئەویش یەکەم کەس بوو لەسەر قەوان مـەقـامی (خـورشـیـدی) تۆمارکرد، ئەویش ئێستا کوڕو کچ و نەوەکـانی خـۆیان بە تورکـمـان دەخـوێننەوە... ئەو دەمـانە (مـەلا سـەدیق)یش مەقامبێژ و شارەزا بوو ماڵیان لـەبـەر تـەکـیێ بـوو، ئـەو خوێندەواریشی نەبووە، کەچی شـارەزاییـەکی زۆر چڕی لە مـەقـامـەکـان هەبوو، بەتایبەتیش (ڕاست و نەوا و ســێـگـا و ئەلـلاوەیسی و خورشیدی و خاوکەر)ی زۆر بەباشی دەچڕی بە هەر چوار زمـانی کـوردی و عـەرەبی و تورکی و فـارسی... بەڵام لە هەمـوو ئەوانەی تا ئێـسـتـا باسـمـان کـردوون، وەک خاڵۆ نووری فـەقێ دەڵێت: تاکـو ئێـسـتـا هیچ کـەسـێـک نەیتـوانیـوە بگاتە ئاسـتی عـەلی مـەردان، چونکە خۆی مەقامێکی وەک (هیجران)ی داهێنا....

نـەوەی دەهـێـنـێ زیـاتـر ئامـاژەی پێـبـدەن هەر لەو سەردەمەدا (حاجی ئۆمەر)ی شـارەزا و پسـپـۆڕی مـەقـام و مامۆستا (میقداد محەمەد عومەر) کە تاکو ئێستاش وەک پسـپـۆڕێک لە (بيت المقام) وانە دەڵێتەوەو دەیان قـوتابی پێ گەیاندووە، وەک مامۆستا میقداد پێی گوتم: جارێک حاجی ئۆمەر دەچێتە


سەلاح داوودە


عومەری حەمەدرێژ


مقداد محەمەد عومەر


خالید جوانرۆ

بەغداو لەوێ (یوسف عومەر)ی گەورە مەقامبێژ دەبینێ، لەوێ یوسف عومەر داوای مەقام لە حاجی دەکات کەبیچڕێ، حاجی عومەریش پێی دەڵێت داوای مەقامچڕین لە من مەکە، پێم بڵێ بە ئارەزووی خۆت چ مەقامێکت دەوێ بۆتی بچڕم، ئەوەبوو چەند مەقامێکی چڕی، دواتر یوسف عومەر دانی پیادێنی و پێی دەڵێت: تۆ مامۆستای هەموومانی...

حاجی عومەر ۱۰۲ ساڵ ژیاوە و لە تەمەنی کامڵبوونی بە باشی مەقامی چڕیوە، هەروەها (سەعدی حەمە گوڵە)ش هەر لەو سەردەمەدا مەقامبێژێکی زۆر ناسراو بووە و دەنگی زۆر خۆش بووە، وەک لێی دەگێڕنەوە، سەعەی حەمە گوڵە کە دەکاتە باوکی مەقامبێژی گەورە حەمە درێژ کاتێک بەیانیان زوو لە تەکیێی تاڵەبانی (سەلا)ی دەخوێند، لەبەر سۆزی دەنگی زۆربەی خەڵک زۆر زووتر هەڵدەستان و چاوەڕوانی (سەلا)ی ئەوەیان دەکرد کە بە مەقامی (مەسنەوی) دەخوێند بۆ ئەوەی لە دەستیان نەچێ.

پاشان یەک لە قوتابییە هەرە ژیرەکانی ئەو قوتابخانە مەقامییە حەمە درێژبوو کە گەیشتە ئەو ئاستەی سوود بە زۆرترین کەس بگەیێ و دەیان قوتابی پێبگەیێ، کە یەک لەوانیش عومەری حەمە درێژە.

هاوکات مامۆستا میقداد محەمەد عومەر کە دەکرێ بڵێین قوتابیەکی هەمان قوتابخانەیە، ئێستا لە دیارترین کەسایەتییەکانی بواری مەقامبێژییە لە کەرکووکدا.

جگە لە قوتابخانە مەقامییەکەی تەکیێ تاڵەبانی، چەندان مەقامبێژ لە دەرەوەی ئەم قوتابخانەیەوە گەیشتنە ئاستێک دەهێنێ ئاماژەیان پێ بدەین، لە نێوانیاندا هونەرمەند (حوسێن عەلی) کە لە هەرە زیرەکترین قوتابییەکانی قوتابخانەی عەلی مەردان بووە، هاوکات هونەرمەند (سەلاح داودە) کە نەوەی (خدر بارامی چاوەش و ئەویش یەک لە مامۆستاکانی عەلی مەردان بوو، وەک عەلی مەردان خۆی دەڵێت زۆرترین سوودی لە خدر بارامی چاوەش و کامیل تەپەلوویی) بینیوە... دوای ئەوانیش چەندان مەقامبێژ و شارەزای دیکەی وەک (شکور خەیات و فایق داودەو خەلیل وەندی و حەسەن گەرمیانی و سابیر کوردستانی و...و...) هاوکات لە گەرمیان لە

سنووری خـانەقین کـە جگە لە (ئای ئای و ئەللاوەیسی و خـورشـیدی) هاوکـات بە مـەقـامـەکـانی (ئەلّوەن و هۆرە) ناسـراوە، (مەحمود وەندی و خوداداد عەلی) لە هەرە ناسراوترین مەقامبێژانی ئەم دەڤەرەن، دوای ئەوانیش (نوری باریکەیی و خەلیل وەندی و ستار دەشتی).. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا مەقامبێژی دیکەش لە کەرکووک و گەرمیاندا سەریان هەڵدا کە تاکو ئێستاش لە ژیاندا ماون وەک (شەوکەت کاکەیی و ئەحمەد فەرەج) و چەندانی دیکەش، لەنێو گەنجەکانیشدا وەک مامۆستا (مقداد محەمەد عومەر) ئامەژەیان بۆ دەکات(خەسرۆ ساڵح و عادیل حەمە سلێمان و حەسەن غەریب) و چەند گەنجێکی دیکەش فێربوون و ئایندەیەکی باشیان دەبێت کە ئەوانیش زیاتر پەروەردەی (بیت المقام العراقي)ن لە کەرکووکدا، دوو هونەرمەندی کەمانچەژەن (خالید جوانرۆ) و (حەربی شوکر)ن ...

لێرەوە بە پێویستی دەبینم بێمە سەر ئەوەی کە لە کەرکووکدا بە حوکمی ئەوەی چەندان پێکهاتە و نەتەوەی تێدا دەژین، تێکەڵاوییەکی زۆر لە نێوان کوردو تورکماندا هەبووە، هەربۆیە دەبینین زۆربەی مەقامبێژەکان وێڕای مەقامە کوردییەکان، شارەزایی زۆریان لە (خۆریات) ی تورکمانی هەبووە، کە (خۆریات) جۆرێکە لە مەقام و لەسەرجەم مەقامەکانیشەوە دەگوترێ و تایبەتە بە تورکمان، ئەو تێکەڵییە جۆرە ئاوێتە بوونێکی لە مەقامەکانیش دروست کردووە، بۆ نموونە هونەرمەندێکی گەورەی وەک (رەشەی کولە رەزا) کە لەناسراوترین مەقامبێژەکانی تورکمانییە، خۆی کوردە و لە خێڵی جاف بووە، هەروەها (عزالدین نعمت) خۆی عەرەبە و هەر بەتورکمانی مەقامی چڕیوە، ئێستاش نەوەکانی خۆیان بە تورکمان دەخوێننەوە.

(خۆریات) یش جۆری زۆرە وەک (کوردۆ، کاسوک، موخالیف، دەلی حەسەنی، مەزان، عیدەلا، عومەرەگەلە، بێشیرێ، دەرمانکەهایی) کە هەر یەکەیان لە مەقامێکەوە دەگوترێن...

لەناسراوو شارەزاکانیشیان وەک (عەبدولواحید گۆزەچی و ئەکرەم دوزلی و محەمەد رەووف و... و...)، هەروەها (هابە) ناسراوترین مەقامبێژی تورکمانە و کوڕی (مەلا برخش) بوو کە کوردەو زەنگنەیە، هاوکات مەقامبێژ بوو بە کوردی مەقامی چڕیوە.

بێگومان هونەری مەقام بواری فرە قووڵ و فراوانە، رەنگە باسکردنی ئاسان بێت، بەڵام کارکردن تێیدا ئەشقێکی فرەی دەوێت و هەروەها بێ کۆتایە ... ئەوەی دەهێنێ لێرەوە لەسەری بوەستین و ئاماژەیەکی بە پەلەی پێبدەین، ئەو گلەیی و گازندانەیە کە هەردوو مامۆستا مقداد محەمەد عومەر و عومەری حەمە درێژ باسیان دەکرد، ئەویش فەرامۆشکردنی ئەم بوارەیە لە لایەن وەزارەتی رۆشەنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە کە ئەمەش وادەکات مەقامە رەسەنەکانمان لەوەش زیاتر بەرەو کزی بچن کە کلتووری رەسەنی ئێمەن... تاکو ئێستاش لە کەرکووکدا تەنها (بیت المقام العراقي) هەیە کە ئەویش سەر بە بەغدایە، زۆر ئەستەمە لە رێی ئەوانەوە مەقامە کوردیەکان بپارێزن، چونکە لەوێدا تەنها مەقامی عێراقی دەگرێتەوە، بۆیە زۆر پێویستە بنکە یان خانە یان ماڵی مەقامی کوردستانی لە کەرکووک بکرێتەوە وەک دەزگایەکی رەسمی بەپشتگیری تەواوی کەلو پەل و ئامێرەکانیەوە، خۆ ئەگەر ئەمەش نەکرێت، دڵنیابن لەوەی کە زۆری پێ ناچی ئەوەی ئێستاش هەیە لە ناو دەچێت.

# ئایا هونەرەکان
# چ سوودێکیان هەیە؟

## WHAT GOOD ARE THE ARTS?

**نووسەر: پرۆفیسۆر جۆن کێری**
**پێداچوونەوە: پرۆفیسۆر سەباح عەبدوڵلا ساڵح**
**ژمارەی لاپەڕەکان: ٢٨٦، ساڵ: ٢٠٠٥**
**بەخشخانە: فەیبەر (Faber)، شار: لەندەن**



پرۆفیسۆر جۆن کێری (John Carey) خاوەن چەند پەرتووکێکی گەلێ بە نرخن لەسەر جۆن میلتۆن (John Milton) و جۆن دون (John Donne) و چارلس دیکینس (Charles Dickens) و چەندین شاعیر و نووسەری ئەدەبی ئینگلیزی.

لەم پەرتووکەدا کێری دەیەوێ لەم پرسیارە سەرەکییە بکۆڵێتەوە:

**What good are the arts?**

واتە: ئایا هونەرەکان چ سوودێکیان هەیە؟

هەر لەسەرەتاوە کێری زۆر بە رقە لەو جۆرە قسانەی کە لە کۆنەوە بووین بە زاراوەی سەرەکی لەگەلێ لە لێکۆڵینەوەکانی هونەری دا، بە تایبەتی لە قسەکانی فەیلەسووفی ئەڵمانی سەدەی هەژدەم، ئیمانوێل کانت (Immanuel Kant).

ئەوەی شایانی باسە، کانت لە پەرتووکە بە ناوبانگەکەی دا Critique of Judgement چەند خاڵێکی کرد بە بەردی بناغەی هونەرەکان لەناو کلتورەکانی رۆژئاوادا:

١. بۆ ئەوەی شتێک پێی بوترێ جوان (beautiful) پێویستە قسەکەر (speaker) لەو باوەڕە دابێ کە هەموو کەس بە هەمان شێوە ئەو شتە دەبینێت.

٢. لەناو هەموو کلتورێک، ئادەمیزاد بە هەمان شێوە بڕیار دەدات چی جوانە چی جوان نیە.

٣. هونەر، بۆ ئەوەی پێی بوترێ هونەر، نابێ هیچ سوودێکی کردەنی (practical use) هەبێت.

٤. هونەر نابێ سۆزداری (sentimental) بێت.

٥. دڵ خۆشکردنی ئادەمیزاد، ئەرکی سەرشانی هونەر نییە.

کانت بەمجۆرە هونەرە دەڵێ **هونەری بەرز** (high art) و بەمجۆرە هونەرمەندە دەڵێ بلیمەت (genius). کێری قسەکانی کانت بە پروپووچ (خەرافات) (superstition) دادەنێت و بەلایەوە شتێکی زۆر سەیرە کە ئەمجۆرە قسانە بووین بە بەردی بناغەی پێناسە کردنی هونەرەکان لە لایەن کلتورەکانی رۆژئاوادا.

لێرە پێویستە ئاگادار بین کە پرۆژەی مۆدێرنزم لەسەر ئەمجۆرە قسانە دامەزراوە و یەکێ لە نووسەرەکانی ئەم پرۆژەیە، ئارتەر دانتۆی ئەمریکی (Arthur Danto) هەوڵێکی پروپاگەندەیی زۆری دا بۆ پەیدا کردنی جۆرە پیرۆزایەتییەک بۆ قسەکانی کانت. مەبەستی دانتۆ ئەوەبوو کە پرۆژەی مۆدێرنزم بەسەر پرۆژەی رۆمانتیکی زاڵ بکات و بە گوێرەی قسەکانی کانت رەخنەی ئەدەبی و هونەری بچەسپێنێ. دانتۆ، وەکو کانت، لەم باوەڕە دابوو کە زۆربەی میللەت لە خێووتامی هونەر و ئەدەب ناگەن. واتە میللەت پێویستی بە خەڵکانی وەکو دانتۆ هەیە، بۆ ئەوەی لە هونەرەکان بگات و بزانێ لە چی بارێکەوە لاوازن و لە چی بارێکەوە بە هێزن.

کێری گاڵتەی بەم جۆرە قسانە دێت، چونکە ئەمجۆرە قسانە لەسەر شتێکی راست پێکنەهاتوون، واتە ئەمەی کە روو دەدات لە مابەینی ئادەمیزادێک و بەرهەمێکی هونەری، هەرچی بێت و هەرچۆن بێت، لە لایەن ئادەمیزادێکی ترەوە دووپات ناکرێتەوە، ئەم هەستەی (Feeling) کە بۆ کانت یاخود دانتۆ یان هەر کەسێکی تر پەیدا دەبێت لە میانەی رووداوێکی هونەری دا، ئەم هەستە تەنها هەستی ئەوانە دەبێ، ئەم هەستە بە هیچ شێوەیەک نابێت بە هەستی ئادەمیزادی تر، جا لەبەر ئەوە، ناتوانین ئەم هەستە حسێب بکەین بە هەستێکی باشتر لە هەستەکانی میللەت، واتە ئەم هەستەی کە بۆ دانتۆ پەیدا دەبێت لە میانەی دیتنی تابلۆیەکی پیکاسۆ، ئەم هەستە نەباشترەو نەخراپترە لەو هەستەی کە بۆ کابرایەکی نەخوێندەوار پەیدا دەبێت لە میانەی دیتنی هەمان تابلۆ.

بۆ ئەوەی بەرگری لە قسەکانی خۆی بکات، کێری، بە پێچەوانەی کانت و دانتۆ، بەم شێوەیە پێناسەی هونەرەکان دەکات:

**Anything can be a work of art. What makes it a work of art is that someone thinks of it as a work of art**

واتە: (هەر شتێک بۆی هەیە ببێت بە کارێکی (بەرهەمێکی) هونەری. ئەم شتە دەبێتە کارێکی هونەری لەو کاتەی کە یەکێک بەو شێوەیە دەیبینێت).

هەست (feeling)، نەک مێشک (rational ground)، بناغەی ئەم پێناسەیەیە، بە گوێرەی ئەم پێناسەیە دەبێ هەموو بەرهەمەکانی هونەر بەهەمان شێوە مامەڵە بکرێن. بۆیە بۆ کێری مۆزەخانە نەک تەنیا مەسرەفێکی زێدە و پێویست نیە، بەڵکو دەبێتە هۆی پەیدا کردنی جیاوازی، واتە مۆزەخانە دەبێت بە جێگایەک کە تێیدا هەندێ بەرهەمی هونەری بە سوپاسەوە جێگەی بۆ تەرخان بکرێ، لێرەدا مەبەستی کێری ئەوەیە کە تابلۆ هیچ سوودێکی نیە بۆ ئەو کەسانەی کە لەناو هەژاری دا دەژین، واتە ئەم پارەیەی کە کۆمەڵ لە هونەرەکان خەرجی دەکات، ئەوە گەلێ جار لەسەر حسابی هەژارەکان ئەنجام دەدرێت.

لەم بارەوەیە کێری ئەم پرسیارەمان ئاراستە دەکات:

ئایا لەچی بارێکدا تابلۆ لە توانای دا هەیە، ئادەمیزاد بکات بە ئادەمیزادێکی چاکتر؟

زۆربەی خەڵک بەم شێوەیە وەڵامی ئەم پرسیارە دەدەنەوە:

لە بارەی رۆشنبیـــریەوە، کـێـــری وەکـــو پرۆفیسۆر فرانک کەرمۆد (Frank Kermode) و تێـــری ئیـگلتـــون (Terry Eagleton) و رۆبەرت شـــۆلز (Robert Scholes) وچەندان نووسەری تر، ئەم وەڵامەیان بەدڵ نیە، کێری وەکو ئەم نووسەرانە، بە شـێـوەیەکی پۆست مۆدێرنزمی لەم جۆرە وەڵامە دەکۆڵێتەوە و دەڵێ سەرچاوەی ئەمجۆرە وەڵامە بریتییە لە جۆرە پێناسەکردنێکی رۆشنبیرییە کە ئەمڕۆ بە درۆ لەقـەڵەم دەدرێ، واتە هەمـــوو خـەڵکێک لە رێگەی هونەر و خوێندنەوە نابێت بە رۆشنبیر.

ئەم قـــــــــەیە دژ بە یەکێ لە بەندە سەرەکییەکانی مۆدێرنزمە کە بەم شێوەیە: بۆ ئەوەی هونەر جـێگای رێز و ئیـعـجـاب بێت، دەبێ پڕ لە قورساتی ووشەیی بێت (Verbal complexity) و ســـۆزداری تێـــدا نەبێت، هەروەها لاســایی زمـانی رۆژانەی مـیـللەت نەکاتەوە. کـێـری بە تایبەتی لەو نووسەرانە بەرقـە کـە خـۆیان بە مـجـێـوری مـۆدێرنزم دامەزراندووە، وەکو تی. ئێس. ئیلیەت (T.S. Eliot) و تـی. ئـی هـولـم (T.E.Hulme) و تیـــۆدۆر ئەدورنۆ (Theodore Adorno) و والتـــەر بەنیـــامین (Walter Benjamin) و چەندانی تر.

کێری دژی ئەم بەندەی مۆدێرنزمە لەبەر دوو هۆ:

١. هەر وەکو پرۆگرامی مۆدێرنزم نیشانمان دەدات، ئەم قسانە هەوڵی ئەوە دەدەن هونەر لە کـۆمـەڵ جـیـابکەنەوە و بارودۆخـێـک دروست بکەن، کـە تێـدا چەند کـەسـانێک بن بە سەرچاوەی دەسەڵات و بڕیاردەری هونەری.

٢. هەروەها ئەم قسەیە ئەوە دەگەیەنێ کە هونەری مـــیللی (popular art) هونەرێکی لاوازو ئاست نزمە.

ئەوەی شـایانی باسـە،ئەنتـرۆپۆلۆجیـا بە هەمـان شـێـوە تەمـاشـای ئەم بەندەی مـۆدێرنزم دەکات، و بەڵگەیەکی زۆرمان نیشان دەدات کە هونەر لە کۆنەوە وەکو ئایین (religion) بووە، واتە بەشێک بووە لە ژیانی هەموو هاولاتیـان، کـێری دەیەوێ هونەرەکانی ئەمڕۆ بەم شێوەیە بن، واتە هەموو کەسێک لە توانای دابێ تێیان بگات و زەوقیان لێ وەرگرێ.

ئەمـــجـــۆرە قـــســـانە نزیکەی نیـــوەی پەرتووکەکەی کێری دەگرێتەوە. نیوەکەی تر دەربارەی ئەدەبە. بەلای کـێـــرییـــەوە، لەناو هونەرەکـاندا، ئەدەب لە هەموویان بەسوودترە، چونکە ئەدەب لە توانای دا هەیە رەخنە لە خۆی بگرێت (critize itself) یاخـود رەخنە لە هەر شـتـێک و هەر کـەسـێک بگرێت.، هەروەها ئەدەب، ســوودێکی تریشی هەیە: دەتوانێ بە هاسانی چاکە و خراپە لێک جودا بکاتەوە.

ئایا هونەرەکـان چی ســوودێکیـان هەیە؟ یەکـێکە لەم پرسیـارانەی کە لە پێش سەدەی هەژدەمەوە، ئاراستە نە دەکرا لەبەر ئەوەی تاکو ئەوکات هونەرەکان وەکو ئایین، گەڵێ بە وردی لەگەڵ ژیانی گەل تێکەڵ بوون. بەڵام ئێستاکە، لە ژێر سێبەری عەولەمە (gloablization) و پۆست مـۆدێرنزمـەوە، هەمـوو جـۆرە مـانا و بروایەک و بارێکی ژیان دەبێ ســـەر لەنوێ پێناسە بکرێتەوە و بناغەی هەموو جۆرە پێناسە و بڕیاردانێک لە بارەی ئایدیۆلۆژیاوە ئاشکرا بکرێت. ئا بەم شـێـــوەیە چی دەڵێین، چی بە چاک دەزانین، چی بە پێـــویـست و دروست دەزانین، چی خـراپ و تارێک حـسێب دەکەین دەربارەی هونەرەکانەوە دەبێ لەمەودوا بخرێنەوە ژێر پرسیارەوە. لەم بارەیەوە پەرتووکەکەی جۆن کـێری گـەڵێ بە سوودە، و ئەم پرسیـارانەی کە دەیکات لە بەرژەوەندی میللەت و هونەرەکانە، بە تایبەتی ئەم دووەیان: ئایا هونەرەکـان دەبێ چی شوێنگەیەکیان هەبێ لە ژیانی کۆمەڵ دا؟

ئایا هونەرەکان هیچ مافێکیـان هەیە بەسەر کۆمەڵەوە؟



# چەند هەناسە شیعرێک

رێدار سابیر محەمەد

(١)
ئاسمان روخسارێکی جوانی بێسنووره
هەور چاوه و
باران فرمێسکێکی دووره
(٢)
توانەوەی مۆم
چ تابلۆیەکی حەزینه
چونکه ئەیەوێ نهێنی تاریکی بزانێت و
بەرگی رەشی لەبەر دا کەنێت و
وەک خۆی رووت رووتی بکاتەوه.
(٣)
نابینا... کەس هێندەی تۆ
تاریکی ناناسێت
کەس هێندەی تۆ
له حیکمەتی مۆم ناگات
(٤)
به مۆم بلّێ
تۆ ئەوەنده لەمن ئەچیت
خەریکه ناوم بنێم (مۆم)
بۆیه ئەبینی گشت شەوێ
ئەتنووسێنم به رۆحی خۆم
(٥)
ئێسته زانیم تۆ بۆچی مۆمت
خۆشی ئەوێ
چونکه مۆمیش وەکو تۆیه
مۆم وەکو تۆ
عاشقێکی رەنجەڕۆیه.



ئازاد مەولوود:

# شانۆ تاکە شتێک بوو غەریبی منی ڕەواندەوە، کە بۆ پرۆڤە یان نمایش دەچوومە ناو هۆڵ و سەرتەختەی شانۆ، هەستم دەکرد تەواو لەماڵی خۆمم



ئا/ب-دۆتمێر

**شانۆ خەریکبوونێکی خۆشە، چۆنی لێک دەدەیەوە، ڕاڤە هەڵدەگرێ، ئەنجامیش ئەو گەمانە پیر نابێت، ئەگەر لەسەر تەختە ئاسمانی لێ تەنگ بوو، ئەوا لە دەرتەختە خۆی دەنوێنێ، ئێمەش شانۆکارێکی وەک ئازاد مەولوود دەبینین لەناوەوە و دەرەوەی وڵات بۆ خەریکبوونی خۆی ئەمەکدارە و لە نواندنی تەلەفزیۆن و سینەمادا مەودا فراوان دەکات، لە چاوپێکەوتنێک (بە کورتی سەرەتا بەر لە کۆتا)، هاتە ئاخاوتن.**

*** پاش خەریکبوونێکی درێژەخایەن، ئێستا چۆن دەڕوانیتە یەکەم ئەزموونی شانۆییت؟**

- من کە بیر لە سەرەتاکانی دەستپێکردنی کاری شانۆیی خۆم دەکەمەوە، مەسەلەکە زۆر پەل و پۆی لێ دەکەوێتەوە و مرۆڤ حەز دەکات باسی هەمـوو شتـەکـان بکات، ئەمـەش دەگەڕێتەوە بۆ دوو هۆ، یەکەمیان یادکردنەوەی ئەو سـەرەتایانە تام و لەزەتێکی هەیە، دووەمیشیان هەر گێڕانەوە و باسکردنی ئەو ئەزموونانە خۆی بەشێکە لە مێژووی سەردەم و کاتێک خەریکە بیر دەچێتەوە.

من لە ناوەڕاستی شەستەکانی سەدەی ڕابردوو لە پۆلی دووی ناوەندی، یەکـەم تێکستی درامیم بە دەستە خۆمەوە بینی، ئەوەی لە بیرمە چیرۆکەکە باسی کابرایەکی دەکرد، جامخانەی نانەوایەک دەشکێنێ و

تانێک دەدزێ، لەسەر ئەم کارەی پۆلیس دەیگرن و ئەویش هاوار دەکات "من دز نیم، من برسیم" ، لە دواییدا بۆم دەرکەوت کەوا ئەمە نووسینێکی ڤیکتۆر هۆگۆ بوو.

ئەم شانۆگەرییە و شانۆگەرییەکی تری مامۆستا تەلعەت سامان، لە چالاکی قوتابخانەکان بوونە مەیدانی راهێنانی یەکەمم، بەلام هیچیەک لەو بەرهەمانە رووناکییان نەبینی.

لەسەرەتای حەفتاکان لەگەڵ حاجی مەجیدی رەحمەتی، راهێنانێکی زۆرمان لەسەر زنجیرەیەکی تەلەفزیۆنی کرد بەداخەوە ئەویش نەگەیشتە ئەنجام، حاجی مەجید بە سەلیقەی کۆمیدی خۆی نووسەر و دەرهێنەری کارەکە بوو، "وێنەیەک لە رابردوو" باسی پەیوەندی نێوان دەسەلات (لە شێوەی پاشماوە و میراتگری کەلتووری پۆلیسی ستەمکاری سەردەمی دەولەتی تورکی عوسمانی) و خەلکی یەکێ لە گەرەکە هەژارەکانی شاری دەکرد.

من لە رێگای مامۆستای شەهید حەیدەر کەریم، رێگای ئەو گرووپەم دۆزیەوە کە لە سەندیکای مامۆستایانی کوردستان لە سەیداوە کۆ دەبووینەوە و کارمان دەکرد.

رەسمی جەلال و ئازادە جەلال و عەبدولرەزاق شەمسەددین و محەمەد محیەدین و عەبدوللا ئەحمەد داود و کۆرێکی ناو جەبار و تەحسینی ئامۆزای و چەند کەسێکی تر ئەندامی ئەم گرووپە بوون، دوای ماندووبوونێکی زۆر بەرهەمەکە رێگای پێنەدرا بە بیانووی ئەوەی تانە و تەشەر لە پۆلیس دەدات.

هەر هەمان گرووپ بەردەوامی بە کارەکانی دا و کەوتینە پرۆڤەی "داس" لە "داسەکەیش اسوار"ی ئەمین میرزا کەریمەوە.

فەتاح خەتاب لە هونەرە جوانەکانی بەغدای دەخوێند و بوو بە دەرهێنەرمان، شانۆگەریەکەمان لە ١٩٧٢ لە هۆلی گەل پێشکەش کرد و سەرکەوتنێکی چاکی بەدەست هێنا، سالی پاشتر هەمان شانۆگەریمان لە



یەکەمین فیستیڤاڵی شانۆی لادێمان دامەزراند کە دواتر لەسەر دەستی چەندین برادەری تر درێژەی پێدرا.

ئەگەر لە دوای ئەم پێشکەوتنە بێمەوە سەر پرسیارەکەی تۆ، دەڵێم بەشداریم لەم شانۆگەریە بە یەکەم ئەزموونی راستەقینە، رووناکی دیتەی خۆم دەزانم، لە لایەنی فیکری و سیاسیەوە کاری شانۆیی من لەو سەردەم و کاتەدا دەربڕینی هەست و بیری تێکەڵاوی چینایەتی و نەتەوایەتی بوو، ئەم هەستەش هەستێکی گشتی بوو لای زۆربەی برادەرە چالاکەکانی ئەو کات.

لایەنە نەتەوایەتییەکە لە دامەزراندنی شانۆوە خۆی دەنواند، من و زۆرانی تر لەو باوەڕە دابووین کەوا ئێمەش وەکو نەتەوەیەکی زیندوو پێویستە شانۆمان هەبێ، ئەو هەنگاوانەی حەفتاکانی ئێمە تەکانێکی مەزن بوو لە ڕێڕەوی مێژووە کورتەکەی شانۆمان، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی وەک ئەوە وابوو کە لای هونەرمەندان بڕیارێک درابوو کە شانۆ پێویستە و دەبێ کاری بۆ بکرێ.

لە لایەنی هونەریشەوە دەتوانم بڵێم زانیاری و شارەزای تیۆری و تەنانەت پراکتیکیشم لە سنوورێکی تەسکدا بوو، یاخود لە قۆناغی بناغەدانان بوو، بەڵام ئەوەی وای دەکرد بەردەوام بم، ئەو عیشقە گەورەیە بوو بۆ هونەر و شانۆ، من بۆ نموونە لە شانۆگەری "داس" بە تەواوی تێکەڵ بە رۆڵی کەسایەتییەکە بوبووم، کە لەو سەردەمە کتێبەکەی ستانسلاڤسکیم لەمەڕ کاری ئەکتەر خوێندەوە، بینیم من زۆر لەو ڕێنماییانەی ئەو پیاوە مەزنەم بە خۆڕسکانە پیادە کردبوو، هەر بۆیەش بوو، تێگەیشتنی کتێبەکە کارێکی سەخت نەبوو، و بەدڵ و بەگیان، بەڵام بە شێوەیەکی خۆڕسکانە، چێژ و خۆشیم لێ دەبینی و بەو داهێنانە بەختیار دەبووم، خۆڕسکی کارکردن لەو قۆناغەدا دووسەرە بوو، لە لایەکیان داهێنانێکی زۆر ڕاستگۆیانە بوو، چونکە ئەو داهێنانە کردارێکی جلەونەکراوی سفت و خاو و بێ خلەت بوو کە لە هەستێکی شەقڵنەکراو و بێسنووردا سەرچاوەی دەگرت، کەچی لە لایەکەی تردا مەترسی هەڵەی گەورەی لێدەکرا لەبەر لاوازی بنەما زانستی و تیۆرییەکان، وەکو دەزانین مەسەلەی سەلیقە و بەهرەی ڕووت بەس نیە بۆ داهێنانی هونەرمەند.





*** لە مێدیای هونەریدا، زۆر باس لە قەیران و مردنی شانۆ دەکرێ، ئێوە ئەم بارە چۆن دەبینن؟**

- ئەوەی من گوێبیست دەبم و تێبینی دەکەم لە شانۆ لە کوردستان بە ڕاستی کەوتۆتە قەیران، ئەمەش تەنها لە شارێک یان لە شوێنێک نییە، بەڵکو بەلای کەم سەرجەمی شارە گەورەکانی گرتووەتەوە، قەیرانەکە خۆی لە چەند ڕوویێکەوە وەدیار دەخا، لەوانە کەمی بەرهەمی شانۆیی، کەمی ژمارەی بەرهەمی چاک و داهێنەرانە و بە پێز و لەبەرامبەر ئەویشدا بوونی چەند بەرهەمێکی کرچ و کاڵ، پشتکردنە شانۆ لە لایەن بینەران و خەڵکەوە بە گشتی، تەسک بوونەوەی ئەو پانتاییەی شانۆ لە مێشکی خەڵکدا داگیری دەکات، کزبوونی ئەو هەستەی جاران بە پێویستی شانۆ لە ژیانی خەڵکدا، ئەمانە و زۆر نیشانەی تر ئەوە دەردەبڕن کەوا شانۆ بەشێکی زۆری ئەو پلەوپایە و ڕێزەی هەیبوو وەکو بوارێکی داهێنان، لە دەستی داوە و دۆڕاندوویەتی، ئەم دیاردەیە هەروا لە خۆڕا دروست نەبووە، بە رای من ڕاپەڕینە مەزنەکەی سەرەتای نەوەتەکانی سەدەی بووری، لافاوێک بوو تەخت و تاجی زۆردارو داگیرکەر و ڕەگەزپەرستەکانی ڕامالی، ڕاپەڕین وەکو بوومەلەرزەیەکی سیاسی بنەماکانی کۆمەڵی دەقگرتوو و بندەستی سڕ و مەیبیو و مەنگی فەرزکراوی هەڵتەکاند، هەموو ئەم بنەمایانە دووبارە پێویستیان بە دروستکردنەوە و بونیاتنانەوە بوو لەسەر بناغەیەکی تەواو جیاواز لەوەی پێشوو، ئێمە وەکو نەتەوە کارمان بۆ ئەم مەبەستە کرد، بەڵام من دڵنیا نیم کە توانیبێتمان تەواوی بنەماکان سەر لە نوێ دروست بکەینەوە، شانۆش کە بەشێکی گرنگە لە ژیانی کەلتووریمان بەر ئەم فەرامۆشی و ناهەقییە کەوتووە، ئەمانە و سەرەڕای باری ئابووری و کۆچ کردنی هونەرمەندانی ڕەسەن و لێهاتوو و بەتوانا و سەرقاڵبوونی هونەرمەندانی ناوەوە بە کاری ڤیدیۆ و تەلەفزیۆن و..چەندین هۆی تر. ئێستا بارەکە زۆر تەشەنەی کردووە و پێویستی بە هەوڵێکی فەوقەلعادەیە، بۆ ئەوەی جارێکی تر خوێن بگەڕێتەوە دەمارەکانی بزاڤی شانۆییمان

و گـورِ و تینی بێتــەوە بەر، لە کـۆنگرەیەکی سـەرتاسـەری شـانۆکـارانی وڵات، دوور نیـە بتـوانرێ چەند چارەسـەرێک پێشنیـار بکرێ بۆ ئەم قەیرانە.

*** ئەوەی دیارە، لە نواندنی شـانۆییـدا، دەربڕینی ئەکـتـەری کـورد زیاتر بە قـسـەیە، دەربڕینی جـەسـتـەییش، کـەم ئاوڕی لێ دراوەتەوە؟**

- من لە لێکۆڵینەوەیەکی سـاڵی ١٩٨٥ مدا (کە نیازمە بەم زووانە بۆ یەکەم جار بڵاوی بکەمـەوە) باسم لە تەکنیکی نووسین کردووە، ژمـارەیەکی زۆر لە شـانۆنامـە خۆمـاڵیـەکـانی ئێـمـە، پەیامی ئامـۆژگـاری کـۆمـەڵایەتی و بۆچوونی سیاسی و نەتەوایەتی و چینایەتییان لە چوارچێوەی وشەدا هەڵگرتووە.

ئێـمـە بۆ چەندین سـاڵ ئەرکی بوارە مەعریفیـەکانی ترمان لە شانۆ بارکرد، لەبەر قۆناغی گەشەکردن و پەرەسەندنی دیارکراوی کـۆمـەڵگەی کـوردەواری، بەڕەوامـان نەزانیـوە شانۆ بۆ وەزیفە جوانکاریەکانی هونەر تەرخان بکرێت، هەردەم لامـــان گـــرنگ بـووە شانۆگەریەکانمان چیمان پێدەڵێن، نەک چیمان پیشان دەدەن، ئەمە میراتێکە لە لامان کەڵەکە بووە. ئەکـتـەریش وەکو کەرستەیەکی سـەرەکی دەربڕین لـە شـــانۆدا هـەر لـەم روانـگـەیـەوە مـامـەڵەی لە تەکدا کـراوە، نموونەیەک بۆ ئەم مـەبەسـتـە دێنمـەوە، لە سـاڵی ١٩٧٤ شانۆگەریەک پێشکەش کرا، ئەکتەرێک لەسەر تەخـتـەی شـانۆ وەسـتـاوە و پەیامی شانۆگەریەکەی لە رستەیەکدا کورت دەکاتەوە، دەیەوێ پێمـان بڵێ کەوا کورد نەتەوەیەکی بێ باوکە و کەس نییە دەس بە سەریدا بێنێ، ئەمە پەیامـێکی سیاسـییە و بە وشە لە قاڵبێکی تراژیدیانەی وشە و بە کـاریگەری هێـزی وشـە دارێژراوە، بەڵام ئەو ئەکـتـەرە بە جـۆرێـک ئەو پەیامـە دەردەبڕێ، کـە هیچ قـەنـاعـەتێک نابەخشێ و بینەرانی ناو هۆڵەکە پێکەنینیان بە تراژیدیای خۆیان دێ، بۆ؟ چونکە ئێمە شتەکان تێکەڵ دەکەین، لەوانەیە ئەو ئەرکە بە وتارێک جێبەجێ بکرێت نەک بە شانۆگەریەک، کەواتە ئێـمـە هەر لە سـەرەتاوە فـۆرمـێکی هەڵەمـان بۆ پەیامەکەمان هەڵبژاردووە، لە لایەکی تریشەوە ئەو ئەکتەرە وا لە ئەرکەکەی خۆی گەیشتووە کە تەنها ئەو رستەیە بڵێ و تەواو، شەرعیەت و رەوایەتی ناوەڕۆکی رسـتـەکە بە تەنهـا بەشی ئەوە ناکـا هونەرێکی راسـتـەقـینە و بە پێـزی لێدروست بێ.

*** لەوەی بینیـوتانە، شانۆی ئەوروپی ئەمڕۆ لە چ دیمەنێک دایە؟**

- ئاسـان نییـە و تەنانەت ڕەواش نییـە بە وەڵامێکی کورت لەو بابەتە هەڵسەنگاندنێکی شـانۆی ئەوروپی بکەیت، جـیـاوازی نێـوان شانۆکان ئەوەندەی ژمارەی ئەو شانۆیانە دەبێ، لە ریپـۆرتوار و بەرنامـەی شـانۆ شـاهانە و تراديشيـۆنيـەكـان زوو زوو شـانۆی کـلاسـیـک دەبینرێ، لە شـانۆکـانی چایخـانە و کـەشـتی درامای کـورت و مۆنۆدرامـا و شـانۆگـەری یەک ئەکـتـەر پێشکەش دەکرێ، لە شانۆ مەزنەکانی موزیکال و بەرهەمی مێژوویی نمایش دەکرێ، لە شـاری کـراکـۆڤی پۆلۆنیـا پیـتـەر برۆکم بینی مۆزیکالی رۆژهەڵاتی پێشکەش دەکرد، کەچی لە کۆپنهاگن مۆنۆدرامایەکی بیکتی خستە سەر تەخـتـە، بابەتەکـان جـیـاوازن وەکـو وتم لە شـانۆیەکـەوە بۆ شـانۆیەکی تر، تیـپی زۆربەی کارە دراميیەکان هەوڵە بۆ تیشک خستنە سەر هەقیقەت، لە نێوان مەرجێکی سوپای رزگاری کـەری ئەمـریکا و کـۆمـپـۆنیـسـتـێکی نازی ئەڵمـانیا لە دوای جەنگی دووەمی جیـهـانی، هەقـیـقـەت دەکـەوێتـە کـوێ؟ کێ مـافی هەیە لێکۆڵینەوە لەگـەڵ کێ بکات؟ ڕاسـتـی لە کـوێيـە؟ لە "شـەوی کـریسـتـاڵ" کـاردانەوەی ووردوخـاشکردنی جـامـخـانەی دووکـانی

جوولەکەکانی بەرلین دەبێ چۆن بێ لەسەر خێزانێکی جوولەکە لە ئەمریکا؟

چیرۆکی ئەو خاوەن ماڵە بەسەزمانەی "بێدەرمان و ئاگرکەرەوەکان"ی ماکس فریش (کە من لە کاتی خۆی ویستم لە هەولێر پێشکەشی بکەم)، نموونەی سەرنج و تێڕوانینە بە دوای هەقیقەت.

ئەم گەڕانە بە دوای دۆزینەوەی هەقیقەت وەکو لەو نموونانەی سەرەوە باسم کرد، یاخود هەقیقەت لە روانگەی جیاجیاوە، تیمەی گرنگی شانۆیە، لێرەدا بە پێویستی دەزانم ئاماژە بە ترادیشیۆنە دیموکراسیەکانی کۆمەڵگای ئۆروپی بکەم لەم بوارەدا، فرە بۆچوون و بۆچوونی جیاواز و قبوولکردنی یەکتر سەرەڕای جیاوازی بیر ئایدۆلۆژیا تەنگی بە تاکڕەوی هەڵچنیوە.

*** چیت لە سینەما و شانۆی دانیمارکییەوە هەڵێنجاوە؟**

- لە ساڵی ١٩٩٥ دوای سێ ساڵ لە گیرسانەوەم لە دانمارک بە شداری یەکەم بەرهەمی شانۆییم کرد بە ناوی "حیکایەتی پیاوێکی دانا" مەبەستم لەم بەشدارییە تەنها ڕێخۆشکردن بوو، بە راستیش هەر وابوو، ئەمە چەند بەرهەمێکی بە پێز و تازەی بەدواداهات، کە هەرگیز من بە خەونیش نەمدیبوون، شانۆ تاکە شتێک بوو غەریبی منی ڕەواندەوە، لەسەرەتادا وەکو کەسێکی تر لە وڵاتێکی تازەدا، منیش هەستم بە نائارەمیەک دەکرد، بەڵام کە بۆ پرۆڤە یان نمایش دەچوومە ناو هۆڵ و سەرتەختەی شانۆ هەستم دەکرد تەواو لە ماڵی خۆمم، تاکە شوێنێک کە شەرم تیایدا دامنەگرێ شانۆ بوو، دڵ و دەروون و زمانم لەوێ دەکرایەوە و دڵم پڕ لە شادی و خۆشی دەبوو و خەندە دەپەڕیە سەر لێوانم، یەکەم جار بوو کەوا بتوانم ئەو ساڵانەی لە شانۆ بەسەرم بردوون، لە ژیانی تایبەتی خۆم بەکاریان بێنم، دوا بەدوای ئەوەی چەندین ئەزموون و تاقیکردنەوەی بەهێزم بینی، وەکو کۆمبارس بەشداری ئۆپرای "لولو"ی ئەلبان بێرگ بووم، ئەزموونێکە هەرگیز لەبیرم ناچێتەوە، لە تەک دەیان ستێرانبێژی ئۆپرای جیهانی لەسەر تەختەی شانۆ وەستاوم، چەندین مانگ و رۆژم لەگەڵ مایسترۆ و دەرهێنەرانی مەزنی جیهان بەسەر برد، گوێم لە ووتە و ڕێنمایی و شارەزایی ئەو کەسانە دەگرت، نیازم وایە وردەکاریەکانی ئەم بەشداریە لە کتێبێک بە وێنە بڵاو بکەمەوە.

لە ١٩٩٦ بەشداری بەرهەمێکی دەرهێنەری سینەمای جیهانی و وەرگری خەڵاتی کان "لارس ڤۆن تغییە"م کرد، بەرهەمێک تازەترین ستایلی دونیای دەنواند، لە نێوان فیلم و پێشانگا و شانۆ، ئەمەیان دەبێتە بەشێک لەو کتێبەی لەوەپێش ئاماژەم پێکرد.

وێنە و ناوم کەوتە ناو کەتەلۆک و کتێبەکانی مێژووی سینەما و لاپەڕەکانی ئەنتەرنێت.

لە چەندین زنجیرە و بەرهەمی تەلەفزیۆنی و سینەمایی دانمارکی بەشداریم کرد و زێتر فێری کاری پرۆفیشناڵ بووم لە بواری خۆم، نرخی داهێنانی خۆم بە چاوی خۆم دیت.

ئەم وتانە پیا هەڵدان نین، هەر لە پێناو ئەوەی باسی خۆم بکەم، ئەمانە بەشێکی گرنگن لە ئەزموونی تایبەتی خۆم.

*** بزاڤی هونەری (مەبەست شانۆو سینەما)ی کورد لە هەندەران چی بە بەرهەم هێناوە وئەم بەرهەمانە چۆنن؟**

- بە پێویستی دەزانم ئەم دوو بوارە لێک جودا بکەمەوە، چەند هەوڵێکی شانۆیی لێرەو لەوێ کراوە، لەوانە هەندێ لە برادەرانی وەکو رەسمی جەلال و کوردۆ سەعید و هەوڵە جددیەکانی د.فازڵ جاف لە سوید، چەند هەوڵێکی پەیمان بەگۆک و میدیا رەووف لە

دانمارک و هەندێ هەوڵی سازدانی فیستیڤاڵی شانۆیی کوردی لە ئەڵمانیا بە بەشداری ژمارەیەک لە هونەرمەندانی پەڕاگەندەی وڵاتانی ئەورووپا.

ئەم هەوڵانە گشتیان پیرۆزن و دڵنیام لە نیازی خزمەت و گیانی هونەری بەشدارانەوە سەرچاوە دەگرن.

ئەم هەوڵانە تا ڕادەیەک بەردەوامی دانە بەو هەناسەیەی نێو وڵاتەوە، زۆربەی زۆری هونەرمەندانی دەرەوە ئەگەر هەموویان نەبێ، بەر لە دەرچوونیان کاری هونەریان لە وڵات کردووە.

ئەوەی من زێتر بە کێشەی دەزانم کەمی بینەرانی شانۆیە، هۆی ئەمەش بۆ پەرت و بڵاوی خەڵکی کورد و دابەشبوونیان بەسەر چەندین شارو گەڕەکی جیا لە هەر وڵاتێکدا دەگەڕێتەوە، ئەمە سەرقاڵی ئەو خەڵکە و ڕادەی هۆشیاری و ئاستی ڕۆشنبیرییان.

تۆ سەیر کە، گرووپێکی شانۆ کۆکەرەوە، دوومانگ پرۆڤە بکە و پارەیەکی زۆر لە بەرهەمهێناندا سەرف کە (کاتیش هەر پارەیە) ئینجا چل پەنجا کەسێک ئامادەی نمایشەکەت بن،.....هەستت چۆن دەبێ !؟

من دەڵێم ئەگەر کاری شانۆی کوردیت دەوێ، ئەو کارە لە وڵات دەکرێ.

لە بواری سینەما مەسەلەکە جیایە، ئەگەر سەیرێکی سەرەتای هەوڵەکانی سەلمان فایق و مەهدی ئومێد و ئەوانی تر بکەینەوە لە هەشتاکانی سەدەی پێشوو، دەبینین لەگەڵ زەحمەتی ڕێگا بڕین، کەچی هەوڵەکان مایەی دڵخۆشی بوون.

دوا بەدوای ئەوان و بەتایبەت لەم ساڵانەی دواییدا چەندین بەرهەم هاتە ئەنجام لەسەر دەستی دەرهێنەرانی وەکو جانۆ ڕۆژبیانی و هونەر سەلیم و ئەنوەر سندی و ئاراس ڕەشید و فیلمەکانی بەهمەنی قوبادی و زۆرانیتر.

یەکێ لە جیاوازیەکانی سینەما لەوەدایە کە هەرکە بۆی لوا ڕێگا ببڕێ، ئەوا دەگاتە ژمارەیەکی زۆر لە بینەران.

بەڵام گیروگرفتی زۆر مەزنیشی هەیە، لە پێشەوەی هەمووشیان دابینکردنی سەرمایەیە، تۆ وەکو دەرهێنەر ئەوەندەت بەس نیە سیناریۆیەکت هەبێ و توانای دەرهێنانت هەبێ، بەڵکو سەختترین خەبات ئەوەیە، لایەنێکی خاوەن پارە بگەیەنیتە باوەڕ کە ئەو پرۆژەیەی تۆ خێری دەبێ بۆ ئەو.

من لەو باوەڕەدام بابەتەکانی بەرهەمی سینەمایی هونەرمەندانی کورد دوای ماوەیەکی زۆرتر دەگۆڕێن و خەڵک خۆیان لە بابەتی هاوچەرخ و تازەتر دەدەن، ئەوەی ئاشکرایە زۆربەی فیلمەکانی ئەو هونەرمەندانەی سەرەوە باس لە چەوسانەوەی نەتەوەی ئێمە دەکەن لە ساڵانی بەر لە ١٩٩٠ .

هەندێک لەو چارەسەریە سینەماییانە زێتر سەرکەوتوون لە هەندێکی تریان.

بەڵام بابەتەکانی ستەم و زۆرداری و ئەنفال و ژێردەستی و کوشتن و بڕین و وێرانکاری بابەتی سەرەکی فیلمەکانمانن.

ئەم بابەتانە هەر نەبێ لەم سات و ئانەی ئێستاماندا دەفرۆشرێن، بەڵام هیوادارم دوای ماوەیەکی تر هونەرمەندانمان زێتر قووڵ بینەوە و ناوەڕۆکی چیرۆک و سیناریۆکانیان پوختەتر و سەرکەوتووتر بێت، هەروەها هیوادارم سەرمایەیەکی زیندوو و دەوڵەمەند لە ناو وڵات بکەوێتەگەڕ و بە تایبەت تەرخان بکرێ بۆ بەرهەمی سینەما.

من گەشەکردنی شانۆ لە ناو وڵاتدا دەبینم و پێم وایە سینەما دەتوانێ لە دەرەوە و لە ناوەوە ڕێگای خۆی بکاتەوە.

*



# شەهابی کاتب

ن: خەسرەو شاهانی
و: محەمەد حەسەن رۆژبەیانی

... ماوەیەکی زۆر لەمەو پێش لە دەزگایەک کارم دەکرد، هاوکارێکم هەبوو بە ناوی (زەینعەلی موفلیس زادە). پیاوێکی لاواز و تاڕادەیەکیش کورتە بالآ و بێ وەی بوو، لە بەشی ئەرشیفی دەزگاکە کاری دەکرد، تا بڵێی کارمەندێکی ئیشکەر و کەمدوو و شەرمەن و دەست کورت بوو، جگە لە ئیش و کاری دەزگاکە، هیچ ئیشێکی دیکەی نەدەکرد، تا ئەو شوێنەی کە من خەبەرداربم و بیزانم، جگە لە جگەرەکێشان هیچ خوو و خولیایەکی دیکەی نەبوو، بەڵام بە قسەی هاوکارانی حەسوود، کە پاشملە قسەیان لەسەری دەکرد، کە گوایە موفلیس زادە جگەرەکێشە و ئەگەریش گیرفانی گەرم بێت، دوور نییە تلیاکیش بکێشێت، ئۆباڵی ئەم قسەیە بە ملی وتیاری.

بەهەر حاڵ رۆژێک سەری بە ژوورەکەی مندا کێشا و وتی:

- کاک فلانی داواکارییەکم هەیە.

وتم : فەرموو.

وتی: لێرە نابێت، ئەگەر بە ئەزیەتی نەزانی هەرکاتێک بۆت رێکەوت سەرێک لە بەشی ئەرشیف بدەن، ئەوێ هەم چۆڵە و هەم کەس ئیشی بەوێ دەکەوێت، لەوێ داخوازییەکەمت پێ دەڵێم، رازی بووم و پاش کاتژمێرێک بۆ ژوورەکەی لە نهۆمی خوارەوە (ژێرزەمین کە بە ئەوراق و پەڕاوی کۆن تایبەت بوو) رۆیشتم و وتم چ فەرمایشتێکت هەیە؟

وتی: ئەوەی راست بێت کاک فلانی من لە ناوەکەی خۆم دڵگرانم.

وتم: مەگەر ناوەکەتان چ عەیبێکی هەیە کاکەی موفلیس زادە.

زەردەخەندەیەکی تاڵی بۆ کرد و وتی:

- من لەو بڕوایەدام زۆربەی بەدبەختییەکانی ژیانی من لەم ناو و ناوی خانەوادە لەعنەتییەوە هاتووە، چونکە نە (زەینعەلی) ناوێکی ئێرانیە و نە (موفلیس زادە). هەردووکیان عەرەبین، دەمویست باوکی گۆڕبەگۆڕم ناوێکی جوانی ئێرانی لێ بنابایەم.

کاتێ ئەم قسەیەم لە زاری (موفلیس زادە)وە گوێ لێ بوو، کە ئەم هەموو نیشتمانپەروەری و ئێران پەروەرییەی لێ دەتکا، لە ناخی دڵەوە شاد و خۆشحاڵ بووم، لەوەش کە دەیویست لە ڕێگای گۆڕینی ناویەوە، ئێرانیەتی خۆی بسەلمێنێت، خونچەی گوڵم شکۆفەی کرد و زمانم کرایەوە و کەمێک دەربارەی مێژووی کۆن و دێرینی وڵات و شانازییەکانی رابردوومان و سەرگوزشتەی ناودارانی وەکو بوزرگ میهر، ئاریۆ یەزخان، روستەمی فەروخزاد و داستانەکانی شانامەی فیردەوسی وەکو شەڕی رۆستەم و ئەشکەبووس و زۆراب و گرد ئافەرید و فەرەیدوون و زوحاک و بیژەن و مەنیژە و گیو و گۆدرز قسەم بۆی کرد و لە دواییشدا پرسیم دەتەوێت چ ناوێک لە خۆت بنێیت؟

دەستی لە گیرفانی نا و کاغەزێکی لە شێوەی پشتگیری دەرهێنا و بەرەو منی درێژ کرد و وتی:

- دەمەوێت ناوی خۆم بۆ (زەینعەلی ئیفلاس پوور) بگۆڕم! چونکە حەز لەم (موفلیس زادە)یە ناکەم.

... هەر لە خۆمەوە پێکەنینم هات، وتم:

- کاکی برا، ئێ خۆ ئەمیش هەر هەمان شتە، چ حەسەن کەچەڵ، چ کەچەڵ حەسەن، بە گۆڕینی (زادە) بە (پوور) پیاو نابێتە ئێرانی، بیرێکی کردەوە و وتی:

- مەگەر نالێین پیتی (پ) فارسییە؟

وتم: بەڵێ! بەڵام خۆ پیاو بە یەک (پ) نابێتە ئێرانی، من وامدەزانی دەتەوێ ناوی خۆت بکەیتە (پوورپشنگ، پەروێز دارا پوور، رۆستەم فەروخ هورمز، پادوسیان، پامفیلێ، مەنوچەهری، فیردەوسی). کاکی برا گۆڕینی (زادە) بە (پوور) گرفتی تۆ چارەسەر ناکات! (چ کڵاو لەسەر یا سەر لەناو کڵاو، بابا عەلی یا عەلی بابا) گۆڕینی موفلیس زادە بە ئیفلاس پوور دوو تای یەک بارن.

نیگایەکی کزو بێ تینی لە چاوەکانم کرد و وتی:

- لەگەڵ چەند کەسێک قسەم کرد و راوێژم پێ کردن، هەرهەموو ئەم ناوەیان پەسەند کرد، ئێستا تکات لێ دەکەم دوو ئیمزا ماونەتەوە، چونکە لەو سێ ئیمزایەی ژێرەوەی پشتگیرییەکە، یەکێکیان برای ژنەکەم، واتا خاڵی منداڵەکان کردوویەتی و ئەو دووەکەی دیکەیان ماونەتەوە. تەماشا دەکەم زۆر دەپاڕێتەوە و جەخت دەکات، هەر لەوێ لە بەردەم خۆی ئیمزام کرد و کاغەزەکەم پێی دایەوە، تا ئیمزای سێیەمیش بە یەکێک لە هاوکارەکانی دیکەی فەرمانگە بکات.

ئەو کاتەی ویستم لە ژوورەکەی بچمە دەرەوە، زۆر بە هێمنی و نهێنی لەبن گوێم وتی:

- تکات لێ دەکەم کاک فلانی لەمبارەیەوە هیچ شتێک لای برادەرانی فەرمانگە نەدرکێنیت، پشتگیرییەکەش لەگەڵ خۆتدا ببە با برادەرێکی دەرەوەی فەرمانگە ئیمزای بکات، چونکە نامەوێت هاوکارانم تێبگەن، پەلەش نییە، پشتگیرییەکە سبەی،

دوو سبەی بهێنەوە.
وتم: بەسەر چاو و لە ژوورەکەی وەدەرکەوتم، ئەوەم دەزانی کە لەم رۆژ و رۆژگارەدا کەم کەس هەیە پشتگیری یاخود داخوازینامەی بە کۆمەڵ ئیمزا بکات، چونکە لە ئاکامە خراپەکانی دەترسێت، پاش ماوەیەک بیرکردنەوە، هەر ئەو رۆژە دوای نیوەڕۆ تەلەفۆنم بۆ (جەمشید بزرگوار)ی هاوڕێی گیانی بە گیانیم کرد، چونکە دەمزانی دەست بەرووەمەوە نانێت و بەرێکەوتیش بێکار و دەست بەتاڵ بوو.

بۆ دیتنی رۆیشتم، وەکو هەمیشە زۆر بە گەرمی بەخێرهاتنی کردم و چایە و شەربەتمان خواردەوە و کەمێک پێکەوە وتووێژمان کرد، پاشان من ئیشەکەی (موفلیس زادە)م باس کرد و کاغەزی پشتگیرییەکەیم پێ نیشاندا و باسەکەشی هەروەک چۆن روویدابوو، بۆم گێڕایەوە و داوام لێی کرد پشتگیرییەکەم بۆ ئیمزا بکات. لەبەر ئەو دۆستە دێرینەم (جەمشید بزرگوار) وەکو ئەسپێی سەر ئاگر تەقییەوە و لە جێی خۆی راپەڕی و وەکو بۆمب تەقییەوە.
- دیارە شێت بوومە و گاڵتە بە گۆڕی بابم دەکەم، ئەگەر نەک ئەو پشتگیرییە، هەر پشتگیرییەکی دیکە ئیمزا بکەم، ئەویش پشتگیری گۆڕینی ناو و ناوی خانەوادە. لە حاڵەتێکدا کە بەو پەڕی توورەبوونەوە خاڵێکی پشت دەستی بە پەنجە پێشان دەدام، وتی:
- من ئەمە چەند ساڵێکە پشت دەستی خۆم بە جگەرە داغ کردووە و سوێندم خواردەوە چیتر ئیمزا تەنانەت لەسەر پشتگیری مەرگی باوکیشم نەکەم! بەراستی کاک فلان لەتۆم رانەدەبینی پاش ئەم هەموو دۆستایەتی و لاف لێدانی دۆستایەتییە بیر لەوە بکەیتەوە



تووشی بەڵایەکەم بکەیت و داوم بۆ بنێیتەوە!

... بە جۆرێک دەست و پێی خۆم بزرکردبوو، کە ئەگەر لەو دەوروبەرەدا کونە مشکێک هەبوایە، خۆمم لێی دەشاردەوە.

زۆر بەکزی و شپرزەییەوە وتم:

- جەمشید گیان! هەی بە قوربانت بم، خۆ من قسەی خراپم نەکرد. بەڵای چی و داوی چی؟!

- لەوە زیاتر دەتەوێت چیتر بڵێیت؟

وتم: ئەم پشتگیرییەم بۆ ئیمزا بکە.

هاواری کرد:

- نایکەم! کاکە نایکەم... چیت لە گیانی من دەوێت. من هیچم لە خێر و بێری هاورییەتی و دۆستایەتی تۆ نەبینی. دە مانگان زیندانی کرام و دوو ساڵ و نیو دەربەدەری و قوربەسەری بەس نییە؟

دیسانەوە... دیسانەوە!...

...خوا خێری هاوسەرەکەی جەمشیدخان بنووسێت، کە لە هاتو هاواری مێردەکەی لێمان هاتە ژوورەوە و خۆی هاوێشتە ناو کێشەکەوە، دەنا زۆری نەمابوو دەست لە یەخەی یەکتری گیر بکەین.

دوای ئەوەی ئاگری تووڕەبوونەکەی جەمشید لەلایەن هاوسەرەکەیەوە دامرکایەوە و منیش داوای لێبووردنم لێی کرد، ئەوجا رووداوەکەم بە بێ کەم و زیاد بۆ هاوسەرەکەی کاکەی (بزرگوار) گێڕایەوە، ئەویش بڕوای پێکردم و زانی هیچ ئاگایەکەم لەو رابردووە نییە، بەددەم پێکەنینەوە وتی:

- کاک فلانی، گوناهی تۆی تێدا نییە، جەمشید لە ئیمزاکردنی ئەم جۆرە پشتگیرییانە یادگاری زۆر تاڵی هەیە، کە پەیوەندی بە چەند ساڵێک لەمەو پێش هەیە، واتە پێش ئەوەی تۆ بناسێت، ئێستاش کە حاڵی تۆزێک هاتۆتە سەر خۆی، با خۆی بۆت بگێڕێتەوە. بە قسەکانی هاوسەرەکەی جەمشیدخان ژوورەکە ئارام بووەوە و دووبارە جگەرەمان پێشکەش بە یەکتری کردەوە و دەستمان بە قسەی خۆش کردەوە و جەمشیدخان کە لەقەبی (بزرگوار)ی بۆ خانەوادەکەی خۆی هەڵبژاردبوو، بەم شێوەیە باسی داغکردنی پشت دەستی خۆیی بۆ کردم و منیش دەق وەکو خۆی بۆ ئێوەی دەگێڕمەوە، دەیوت:

- ساڵانێکی زوو، کە تازە ژنم هێنابوو و منداڵێکی سێ ساڵانەمان هەبوو و خێزانیشم زگی چوار مانگان بوو، برادەرێکم هەبوو بە ناوی (شەهاب کاگپ). واتە خۆی ناوی (شەهاب) بوو و خانەوادەکەشی ناوی (کاگپ) بوو، زۆر لەم لەقەبە دڵتەنگ و بێزار بوو، جارجار بەددەم گاڵتە کردنەوە دەیوت:من نازانم خوالێخۆشبووی باوکم ئەم ناوە نەشاز و بێ مانایەی بۆچی بۆ خۆی و من هەڵبژاردووە؟

لەهەر دانشمەندێک، لەهەر زمانزانێک واتای (کاگپ) دەپرسم، دەڵێن هیچ واتایەک نابەخشێت! نە ناوی جێگایە، نە ناوی میوەیە، نە ناوی گوڵ و جەماد و گژو گیا و ئاژەڵ و مرۆڤە، لە رووی تۆ نەبێت تا بڵێی پیاوێکی میهرەبان و مرۆڤدۆست و هاورێ ویست بوو.

سەرئەنجام رۆژێک، پاش ئەوەی راوێژم بە خەڵک کرد، پێکەوە بڕیارمان دا پشتگیرییەک بەم شێوەیە رێک بخەین:

بە شایەتی ئەو کەسانەی کە بە تەواوەتی خانەوادەکەی ئێمە دەناسن، ناوی خانەوادەی باپیرم و باوکم (کاتب)بووە و بۆ ئاسانکاری یاخود لەبەر نەخوێندەواری فەرمانبەری تۆماری باری کەسایەتی لە کاتی دەرهێنانی رەگەزنامە (کاتب)ی کردووە بە (کاگپ)،

بۆیە ئێمەش لە خوارەوە ئیمزامان کرد.
شەهاب کاگپ
... سێ کەس ئەم پشتگیرییەمان ئیمزا کرد، کە یەکێکیان من بووم، لەبەر ئەوەی کە ئیمزام کردبوو و بە خۆمانیم دەزانی، لە پێش هەموویانەوە بۆ فەرمانگەی باری شارستانی رۆیشتین و عەرز و حالێکمان بۆ گۆرینی ناوی خانەوادەی شەهاب لە (کاگپ) بۆ (کاتب) نووسی و دامان بەدەست کابرایەکی چاویلکە لەچاوەوە، کابراش ناوەرۆکی عەرزوحالەکەی خوێندەوە و بە وردی لەپشت جامی چاویلکە تەڵخەکانییەوە تەماشایەکی قەد و باڵای شەهابی کرد و وتی برۆن هەفتەیەکی دیکە وەرنەوە.
پاش هەفتەکە، کاتێ کە چووینەوە وتی: داواکاریەکەتان هاوپێچ لەگەڵ نووسراوێکدا رەوانەی دادگا، هۆبەی فلان کرا. ئێمەش بۆ ئەو هۆبەیەی کە کابرا ناونیشانی پێداین، بۆ دادگا چووین، ئێمەیان رەوانەی لای پیاوێکی چوارشانەی بەرێز و پرهێز کرد، ئێمەش چووین و خۆمان پێی ناساند.
کابرا رووی لە من کرد و وتی: (جەمشید بزورگوار) کە لە خوارەوە ئیمزاتان کردووە، تۆ خۆتی؟
وتم: بەڵێ! گومانت هەیە؟
وەڵامی نەدایەوە و سەرلەنوێ پرسی: چەند ساڵە (رووی لە کاگپ کرد) ئەم کابرایە دەناسیت؟
وتم: زۆر لەمێژە، حەوت، هەشت، دە ساڵێک دەبێت.
...ویستم بڵێم نەء! تەماشا دەکەم لەسەر پشتگیرییەکە ئیمزام کردووە و دەڵێم باپیریشی دەناسم، کە ناوی خانەوادەکەیان (کاتب)بووە، ئێستا چۆن بڵێم باوکی ناناسم، لەم وەرە وەرەدا وەڵامم دایەوە...
بەڵێ!
- ناوی چی بوو؟
...لەبەر ئەوەی چەندین جار لە قسەکردنەکانی نێوان خۆماندا لە زاری شەهابەوە گوێم لێ بوو کە سوێندی بە گۆری خوالێخۆشبووی باوکی دەخوارد، وتم:
- میرزا عەلی ئەکبەرخانی کاتب*
- ماوە؟
- نەخێر... چەند ساڵێک لەمەوبەر کۆچی دوایی کرد.
...ئەو دۆسییەی کە لەبەردەستیدا بوو، کردییەوە و لەو کاغەزانەی بەردەستیشی هەندێک شتی خوێندەوە و نووسی و پاشان پرسی!
- ناوی باپیری!؟
...تەماشا دەکەم کار بەرەوە ئاڵۆزی دەروات، چونکە ئەمە ماوەیەکە شەهاب هیچ سوێندێکی بە گیانی باپیری گۆربەگۆری نەخواردووە، تا ناوەکەیم لەبیر بمێنێت، وتم:
- لە کاکەی (کاگپ) خۆی بپرسە.
زەق زەق تەماشای کردم و وتی: کاکەی بزورگوار، تۆ لێرە ئیمزات کردووە و شایەتی ئەوە دەدەیت کە باپیریشیان دەناسیت، ئێستا چۆن دەڵێیت ناوی نازانم و لە نەوەکەی بپرسم؟
...پێکەنینم هات، وتم:
- جەنابی سەرۆک تۆیش هێندەی تر بابەتەکە ئاڵۆز مەکە، ژیان و گوزەران بەم گرانی و سەختیە، وایکردووە من ناوی باوکی خۆمم لەبیر بچێتەوە، تۆ ناوی باپیری دۆستێکت لێم دەوێت؟
- ئاوها؟
- بەڵێ، جەنابی سەرۆک.
- باشە، جگە لە شەهاب، هیچ کەسێکی دیکە لە خانەوادە و خزم و نزیکەکانی

دەناسیت و لەگەڵ کامیاندا هاتووچۆی خێزانیتان هەیە و لێیانەوە نزیکیت؟ ناویان بڵێ؟

...ئەی قورم بەسەر! ئەمە چی هەڵەیەک بوو، من کردم، بۆچی جەنابی سەرۆک ئەم هەموو پرسیارە دەکات، بە پێکەنینەوە وتم:

- جەنابی سەرۆک، بەم بەیانییە دڵت گاڵتەی دەوێت؟

ناوچەوانی جەنابی سەرۆک گرژبووەوە و هاتەیەک و بە تووڕەییەوە وتی:

- ئەمە گاڵتە نییە، بە راستی وەڵامم بدەرەوە.

تەماشا دەکەم زۆر جدییە، جۆری قسە و رەفتاری جەنابی سەرۆک لە قسەی کارمەندێکی قۆشمە و گاڵتەچی ناچێت، وا پێدەچوو بابەتەکە رەگ و ریشەی بەلایەکی دیکەی دا کوتابێت، کەمێک ورەم بەردا، بەڵام پاشان ورەم وەبەر خۆم خست و وەڵامم دایەوە:

- چەند کەسێکیان دەناسم، بەڵام وەکو ئەو ناسینە نییە کە کاک (شەهاب) دەناسم.

...جەنابی سەرۆک قورگی پاک کردەوە و وتی:

- باشتر! باشە کاک شەهاب، ئێوە بۆ دەتانەوێت ناوی خانەوادەیەکی واچاک و پرخێر و بەرەکەت بگۆڕن؟

- چونکە جەنابی سەرۆک، هیچ واتایەکی نییە.

- چی واتای نییە؟

- ئەو (کاگپ)ە کە ناوی خانەوادەکەمانە!

- چۆن واتای نییە؟

- نییەتی جەنابی سەرۆک، لە هیچ فەرهەنگ و فەرهەنگستان و زماننامەیەکدا واتایەکمان بۆی نەدۆزییەوە، ناوی خانەوادەی خەڵکانی دیکە هەریەکەو واتایەکی تایبەتی یا گشتی هەیە، منیش بە ملی شکاوم خۆم لە قسەکانی شەهاب هەڵقورتاند و وتم: بەڵێ، وەکو گەنج بەخش، زراندوو، جامی، شیرازی، ئەسفەهانی، تەورێزی، حوسێنی، حەسەنی، بەڵام ئەم (کاگپ)ە هیچ واتایەک نابەخشێت.

جەنابی سەرۆک کەمێک بە پەنجە گۆشتنەکانی پشت سەری خوراند و دیسانەوە هەندێک شتی دیکەی لە دۆسییەکەدا تۆمار کردو دواییکاغەزێکی سپی لەبەردەست شەهاب دانا و پێنووسێکی دا بەدەستییەوە و بەدەم زەردەخەندەیەکەوە کە کاری لە ناخ و مێشک و بڕبڕەی پشتی من و شەهاب کرد، وتی:

- ئێستا واتاکەیتان بۆ لێک دەدەمەوە...

لە شێوەی فەرمان بە شەهابی وت:

- بنووسە (کا)! پێش ئەوەی بنووسی کەوانەیەک بکەرەوە و لە ناو کەوانەکەدا بنووسە! نووسیت؟

- بەڵێ قوربان!

- خاڵێک دابنێ، (گ) بنووسە!... نووسیت؟

- بەڵێ قوربان.

- خاڵێکی دیکە دابنێ. بنووسە (پ)

... من هەستم کرد ماوەیەکە بەم وشەیە ئاشنام، بەڵام هەرچەندە مێشکی خۆمم گوشی و هێنام و بردم هیچم بیر نەهاتەوە

- نووسیت؟

- بەڵێ... جەنابی سەرۆک.

- ئێستاش ئەوەی نووسیوتە بە دەنگ بیخوێنەوە!

- بەسەر چاو قوربان (کا. گ. پ).

نەعرەتەی جەنابی سەرۆک وەکو بۆمب لە بنمیچەکەدا دەنگیدایەوە:

- سەگبابینە... وا، وا لێکراوینە، هیچ و پووچینە! تازە بە تازە دەڵێن ئەم لەقەبە پڕ

خێر و بەرەکەتە هیچ واتایەکی نییە؟ کاگپ واتای نییە! ها؟.

عـارەقـەیەکی سـاردی وەها دەردا، هەر دەتوت برا فڕییان داومەتە نێو حەوزێکی بەفر گرتووەوە، ئەژنۆکانم کەوتنە لەرزین، ئێستاکە من و شەهابی قوڕبەسەر لەواتاکەی گەیشتین و زانیمان چی هەڵەیەکمان کردووە.

بەدەم تەتەڵەکـردنی زمـانەوە، کـەوتینە پاڕانەوە و ویستمان بە جەنابی سەرۆک بڵێین کـە بەمْ جـۆرە نیـیـە، کـە ئێـوە بیـری لێ دەکەنەوە. وەڵڵا و بیللا ئەسڵـەن ئێمە وای تێنەگەیشتبووین کە....... قسەکەی پێمان بڕی و بە شێوازێکی گاڵتە ئامێزەوە، کە لە جنێو و قسەی ناشرین خراپتر بوو، وتی:

– خەڵکانی دیکە پۆشتە و پەرداخی... ئێوەی بەدبەختیش خۆتان داوەتە بەر هەتاو و ڕێک و راست دەڕۆن، زۆریش بەبێ شەرمانە بە پێی خـۆتان هاتوونەتە ئێـرە و دەتانەوێت ناوی خـانەوادەکـەتان لە (کـاگپ)ەوە بۆ (کـاتب) بگۆڕن. بەبیـانووی ئەوەی (زمـان خواردەکەنەوە) و دەڵێن واتای نییە و... لە هیچ فـەرهەنگ و گـۆڕسـتـانێک واتایان نەدۆزیـیەوە، دەتانەوێ کلکی کـەلەشـێـر بە سـوێندی ئیـمام عـەباس بشارنەوە، هەی بێ شـەرمەنـینە،... زمـانی شـەهاب بە تەواوەتی بەسـتـرابوو، بۆیە من لەسـەری هەڵمـدایە و وتم:

– جەنابی سەرۆک پەلە لە بڕیاردان مەکە، تۆ تەمـاشای جیـاوازی نێـوان کاتب و کـاگپ خـەتێکی بچـووکـە و دیارە ئەو کـەسـەی شـوناسنامـەکـەی بۆ دەرکـردووە هەڵەی لە نووسینەکەدا کردووە، یاخود کاتبی بە کاگپ بەرگوێ کەوتووە، یانیش نوخـتـەکانی (ت) یەکـەی بە جـۆرێک داناوەکـە، وەکـو (گ) بخـوێندرێتەوە، ئەم قـوڕبەسـەرەیش بە دوای بۆچوونە هەڵە و سـادەکـەی ئەو فـەرمـانبـەرە نەخـوێندەوارەوە گیـرۆدە بووەوە... بۆ چەندین جـار قسـەکانی پێ بڕیم و وەکـو هەمـان بۆمب کە پێشتر تەقاندبییەوە گوتی:

– ئەم قسـە جوان و بریقـەدارانە لە دادگـا بکەن. هەی سەرشۆڕ و بێگانە پەرەستینە!

... کـاکـە گـیـان با لەوە زیاتر سـەرت نەئێشێنم، دوو مـانگی تەواو لە ژووری (تاکە کـەسی) مـامـەوە، هەشت مـانگیش پرس و جوویان لەگەڵدا کردم و لەو ماوەیەدا من ئاگام لە شەهاب نەما، کە ئێستاش هەر ئاگام لێی نیـیـە، واتە هەر لەسـەرەتاوە لە یەکـتـری دابڕاین، بەڵام منیـان پاش دە مـانگ ئازاد کـرد، دوو سـاڵ و نیـویش بە ژنێک و دوو منداڵەوە بێکاری و دەردەسەریم کێشا.

ئێـسـتـاش تۆ هاتووی دووبارە ... تووشی هەمان داوم بکەیتەوە؟

بەشەرمەزارییەکی زۆرەوە وتم:

– جەمشـیـد گـیـان خۆ من هیچ ئاگـام لەم کەین و بەینە نەبوو، بەڵام زۆر سەیرم پێهات کـە تۆ چۆن لە پڕ وەکـو گـوللە دەرپەڕیت و تەقیتەوە...

باشە ئێسـتـا من چی وەڵامی (زەینعەلی موفلیس زادە) بدەمەوە؟

وتی:

– با مـوفلیس زادە ملی بشکێت، ئاخـر ئەو ناوە جوانە چ عـەیبێکی هەیە وا دەیەوێ بیگۆڕێت؟ ها!؟

**ژێدەر:**

کۆمەڵە چیرۆکی گنج (باد اورد)

* ئەم ناوەش وەکو چیرۆکەکە خەیاڵییە و خوانەخواستە ئەگەر لەگەڵ ناو و خانەوادەی یەکـێکدا یەکی گـرتەوە، ئەوا من مـەبەسـتم نیـیـە و پێشـەکی داوای لێبـووردن دەکـەم – خەسرەو شاهانی–

* (K.G.P) دەزگـای هەواڵگریـیـەکـانی روسیای پێشوو،... وەرگێر.





# جیهان ساڵانە دوو ملیار گوڵ بۆن دەکات

ئامارەکانی بۆرسەی گوڵ لە هۆڵەندا ئاماژەی بەوە کردوە کەوا ساڵانە دوو ملیار گوڵ لە جیهاندا بەکار دەبرێ، سەرباری (١٩٠ ملیۆن) ڕووەکی گوڵدار کە ئەمەش قەبارەی بازرگانی گوڵە لەو بۆرسەیەدا کە ڕۆژانە (٥٠) هەزار بۆندی تیا مۆر دەکرێ و بە فڕۆکەی تایبەتەوە بۆ ئەم مەبەستە لە نێوان وڵاتە یەکگرتوەکان و ژاپۆن و ئەوروپا و ئەفریقیا گوزەر دەکات

لە وڵاتی هۆڵەنداش لە ناوچەی (ئەلسمیر) بۆرسەیەکی جیهانی بە ناوبانگ هەیە کە وەکو زیاد کردنێکی ئاشکرای کڕین و فرۆشتنی گوڵە کە هەموو وەبەرهێنەر و بەکاربەر و فرۆشیارەکانی گوڵ لە دونیادا تیایدا کۆ دەبنەوە.

هەر چەندە ئەمە لە جیهانی پێش کەوتوودا ڕوودەدات، بەڵام لە زۆر شوێنی دواکەوتوودا تا ئێستا گوڵە لاستیک دەکرێتە چەپک و لە بۆنەکاندا وەکو دیاری پێشکەش دەکرێ.





# کفتەی سابوونکەران

ئا: کاززان نەجمەدین

خۆراکیش مێژووی هەیە، پێکهاتە و لێنانیشی هونەری دەوێ، خۆراکی مرۆڤی کورد لە خێروبێری خاکەکەی وەرگیراوە و هەندە شوێن ناوبانگیان پێ دەرکردووە لەوانە: کفتەی سابوونکەران و کفتەی ڕەواندزیان، لێرە لە سۆراغی خۆراکە بەناوبانگەی شاری سلێمانی ئەم کورتە بابەتە سازدراوە.

لە میانەی چاوپێکەوتنەکەماندا چاومان بە باجی بەهیە کەوت کە (لە دایک بووی ساڵی ١٩٣٧)ە پرسیارێکمان ئاڕاستە کرد سەبارەت بەکفتەی سابونکەرانەوە، ئەویش وردو درشت بۆمان دوا:

منداڵ بووین دایکم کە کفتەی دروست دەکرد، ئێمە بە دیاریەوە دادەنیشتین، لە پێشا برنجەکەی شوشتوتەوە، ئینجا قیمەکەی تێکەڵ کردووە، ئەو سەردەمە قیمە لەسەر تەختە و قیمەکێش ورد دەکرا، برنج و



قیمەکەیان جوان هەڵنەشێلا ئەیانوت با هەڵنەوەشێت، لە دوای ئەوە پیازیان بۆ ئەجنی و کەرەوزیان تێ ئەکرد و لەگەڵ قیمە بایەم (بادەم) و کشمیش و گوێز، ئیتر ئەمانەیان هەموو بەیەکەوە سوور ئەکردەوە، پاشان قیمە و برنجەکە کە تێکەڵ بووە جوان پانیان دەکردەوە و قیمە تێکەڵەکەیان دەکرد



ناو برنج و قیمە شێلراوەکەوە، خڕیان دەکردەوە و لەسەر سێنییەک دایاندەنا تا کاتی لێنانی کفتەکە، لە دواییدا نۆکاوەکەیان بۆ لێدەنا و گۆشتی باشی تێدەکەن، ئینجا کفتەکەیان دەکردە ناو ئاوی نۆکاوەکە و دەکولا، ئیتر ئێمەش لە دایکمانەوە فێربووین و ئێستا لەماڵی خۆماندا لێی دەنێین.

بابزانین لەمەڕ کفتەوە خاتوو بەدریە حەسەن چی دەڵێ:

– جارێ وا هەبووە گرەویان لەسەر گەورەییەکەی ئەم جۆرە کفتەیە کردووە. لە رووی پێکهاتەی و دروست کردنەکەشی بریتییە لە:

گۆشت و قیمە و برنج و پیاز و کەرەوز و کشمیش و بادەم و گوێز و چەند بەهاراتی تایبەتی خۆی تێدەکرێ.



سەبارەت بە ئەم جۆرە کفتەیە خێزانی وا هەیە کە دەیخۆن، توورەگەی خامی بۆ دەدورێ و کفتەکەی تێدەکرێ، لە بەر گەورەیی بۆ ئەوەی هەڵنەوەشێت، لەناو کفتەکەدا هێلکەیەکی تێدەکەن قیمەکەیتێدەچەقێنن، ئینجا دەکرێتە ناو کفتەکە و قەپاتی دەکەن، بۆ ئەوەی بزانن ئەو کفتەیە چەنێک گەورەیە کە ئەو هێلکەیەی تێدا جێ بۆتەوە.

ئەم کفتەیە پێی دەڵێن (کفتەی برنج)، ئەمیش بە دوو جۆر لێدەنرێ: جۆری یەکەمیان بە رەنگی سوور لێ دەنرێ ئاوی کفتەکە سلقە و گۆشتی چاکی تێدەکرێ، جۆری دووهەم نۆک و گۆشتی چاکی تێدەکرێ و بە رەنگی زەرد لێدەنرێ. بەڵام ئەم جۆرەیان زیاتر لە شاری سلێمانی لێدەنرێ، جۆرێکی تر هەیە کە پێی دەڵێن کفتەی برِوێش ئەمەیان لە شارەکانی تری کوردستان زۆر ئامادە دەکرێت. کفتە کاتێکی دیارکراوی بۆ نییە واتە لە هەموو وەرزێکدا لێدەنرێ، چونکە خواردنێکی تاسووقە و زیاتر بۆ بۆنە و میوان لێدەنرێ.







# گرنگیدان بە نینۆک

خانمی بەڕێز، دەمانەوێ ئەم ڕاستییە بزانیت کە نینۆکی دەست، هەفتانە بە تێکرایی یەک ملیمەتر گەشە دەکات و ئەوەش دوو ئەوەندەی خێرایی گەشەکردنی نینۆکی پێیە، بۆیە ئەوەندە دەهێنێ بە ڕێکوپێکی گرنگی بەنینۆکەکانی دەست بدرێ و ئەم کارانەی خوارەوەی بۆ بکرێت.

١. خانمی بەڕێز، بۆیەی کۆنی نینۆکەکانت بە ماددەی (ئەسیتۆن) بچوێنە، ئینجا هەردوو دەستەکانت بخە ناو دەفرێکی پڕ لە ئاوی مەیلەو گەرم و کەفی سابوون بۆ ماوەی ١٠ خولەک و کەمێک لەتە لەیموونیشی بخەسەر تاکو پێستی دەوری نینۆکەکانت نەرم بکاتەوە و شتە نیشتووەکانی ژێریان لاببات و ئەگەر نینۆکەکانت وشک بوون، ئەوا کەمێک ڕۆنی زەیتوون یا بادەمیان بخەسەر بە شێوەیەکی هەفتانە.

٢. ڕۆخی نینۆکەکانت بە ڕۆنی (مانیکۆر) بسڕەوە و بە پەنجەی گەورەت بە شێوەیەکی بازنەیی هەڵیان بگلۆفە.

٣. وردە پێستی دەوروبەری نینۆکەکانت بە مەقەست ببڕە و بە مەورەتێکی داریش ڕۆخەکانیان بکرێنە، چونکە نینۆک برین بێ هێزیان دەکات و شەق شەق دەبن.

٤. هەردوو دەستەکانت بە کرێم نەرم بکەوە، ئنجا نینۆکەکانت بۆ جاری دووەم بە ماددەی (ئەسیتۆن)ی سووک کراو بسڕەوە، تاکو شوێنەواری کرێمەکە لادەبەی.

٥. بۆیەی ئەساسی بخەسەر نینۆکەکانت و لێیان گەڕێ تاکو بە تەواوی وشک دەبنەوە، ئنجا بەو ڕەنگەی حەزت لێیە بۆیەیان بکە و ئەو بۆیەش بۆ جاری دووەم بەکار مەهێنە تاکو بەچاکی بۆیەی جاری یەکەم وشک دەبێتەوە، ئنجا کەمێک لە جۆرە بۆیەیەکی دەرەکیان لێبدە تاکو بۆیە ئەسڵیەکە بە تەواوی دەچەسپێ و (٥) خولەک چاوەڕوان بکە، هەتا بۆیەی نینۆکەکانت وشک دەبێتەوە.

### هەندێ ئامۆژگاریی یاریدەدەر
### بۆ هەڵبژاردنی بۆیەی گونجاو بۆ نینۆکەکانت

خانمی بەڕێز

لە بازاڕدا گەلێک جۆرە بۆیەی نینۆک هەنە و بۆ بەکارهێنانی ئەو بۆیەی لات پەسندە پێویستە هەندێ تاقیکردنەوە ئەنجام بدەیت و سوود لەم زانیارییانەی خوارەوەش وەرگری:

١. ڕەنگی بێجی و عاجی هەڵبژاردنێکی باشە بۆ نینۆکی کورت.

٢. ڕەنگی مەرجانی و پرتەقاڵی بۆ نینۆکی ئەو ئافرەتانەی ڕەنگ ئەسمەرن زۆر جوان و گونجاوە.

٣. ڕەنگی سوور ڕەنگێکی یەکجار جوان و نایابە بۆ دەست و پەنجەی هەموو جۆرە پێستێکی دەست و پل و هەتا نینۆکەکان درێژترین ڕەنگی سووری گەش پتر دەگونجی لەگەڵیاندا و ئەو ڕەنگەش پتر بۆ ئەو دەستانە دەست دەدات کە گرنگییەکی زۆریان پێدەدرێ.

٤. ڕەنگی سووری تۆخ و یا قاوەیی بۆ دەستی ئافرەتی جوان و جاهێڵ بە جوانی دەگونجێ.



# پۆشاکی کوردی جەستە لەناو رەنگستاندا

پ- سلێمانی

مرۆڤ هەر لە سەرەتاوە هەوڵی داوە خۆی جلپۆش بکات، بەرادەیەک پۆشاک بۆتە ناسنامە، ناسنامەیەکی جوان و رەنگین. جلوبەرگی کوردیش بەو ئەندازەو جوانیەی خۆی سەرنجی هونەرمەندان و رۆژهەلاتناسانی راکێشاوە.

لێرە بۆ پێدانی زانیاری لە بارەی پۆشاکی خۆماڵییەوە، چاومان بەو ئافرەتە بەرێزانە کەوت.

بەڕێز ئامینە ڕەحیم محەمەدمان دواند.

*** جلی کوردی لەچەند پارچە پێک هاتووە؟**

- لە ڕاستیدا پێکهاتووە لە کراس و ئێلەک و سەڵتەو کەواو دەستماڵ و جەفتە و ژێرکراس و ئاوەڵکراس.

*** چۆنیـەتی بەکـارهێنانی ئەم پارچانە چۆنبوو، چۆنیشیان لەبەر دەکرد؟**

- لەپێش هەموو شتێکەوە کراسەکە لەبەر دەکـرا لەگـەڵ ژێرکـراس و ئاوەڵکراسـەکـە، هەروەها ئێلەک لەسـەرەوە لەبەر دەکـرا لەگـەڵ ئەوەشـدا سـەڵتـەش لەبەر دەکـرا، جـاری واش هەبووە کـەوا لەبەرکـراوە، سـەڵتـەش لەسـەر کەواکەوە بەتایبەتی لای ژنانی لادێ باوبووە.

هەروەها دەسـتـمـاڵیش لەگـەڵ فـێـست دەبەسـتـرا، ژنانی کـۆن زۆر ئەیانکردە سـەریان لاگیرەی پێوە بووە.

شـتـێـکی زیو هەبوو پێـیـان دەگـوت(بەرچاوگـە)، ئەوەش ژنانی کـۆن بەکاریان دەهێناو لەسەریان دەکرد.

دەسـتـمـاڵەکـەیان لیرەیەک بەتەوقی سـەری فێسـتـەکەوە بوو، دەسـتـمـاڵەکـە تاڵێکی پێوە بوو، ئەو تاڵەیان دەکـرد بە لیـرەکـەوە، ئینجـا بەشـان و ملیـانـدا ئەهاتـە خـوارەوە، هەروەها لەپێشەوە بە ڕاست و چەپ ئەیانبردە دواوە.

*** جۆری قوماشەکە لەچی پێکهاتبوو؟**

- جۆری ئەم دەستماڵە لە نازناز پێکهاتبوو لە قـوماشێـک پێیان دەوت (فرمێسـک)چونکە شـێوەی فـرمێسـک لەسـەر قـوماشـەکـە بوو و جۆرێکی تریش پێیان دەوت (تەرزە و باران)

*** لەگەڵ دەستماڵدا چیتر بەکار دەهات؟**

- چەفـتـە هەبوو ئەمـەیان بەسـەر دەسـتـمـاڵەکـەدا ئەکـرد و پێـکهـاتـبـوو لە قـومـاشـێـکی یەک مـەتری ئەیاندووری، شـێـوەیەکی چوارگۆشـەیی هەبوو، دوو لای ئەم چەفـتـەیەشـیـان پێـوە ئەدووری پێـیـان دەوت قـەیتان، ئینجا سـەرێکیشی بەقەیتانەکە گرێ



ئامینە ڕەحیم محەمەد

ئەدرا، ئەیانکرد بەسـەریانەوە بەسـەر شـان و ملیـانداو بەسـەر دەسـتـمـاڵەکـەیاندا ئەهاتە خوارەوە.

*** جۆرەکانی کەوا کامانەن؟**

- دوو سێ جـۆری هەیە جـۆرێکی بەلۆکـە ئەیاندووری، ئەمـە کـەوای ناوداریان پێدەوت، سـورمـەکـەی سـورمـەی گـوڵ هەڵتـۆقـیـویان پێ ئەوت، ئەوا بە زۆری ژنەکـانی کـۆن ئەیانکرد، هەروەها بەشی ناوەوەی خـام یان چیـتـیـان پیـائەکـرد ، ئینجـا لەدواشـەوە سێ لاسکی هەبوو، لاسکێکی لە ناوەڕاستەوە بەرئەبۆوە بۆ خـوارەوە، دوو لاسکەکەی تریش دوو گـیـرفـانی هەبوو لە تەنیـشـتـەوە ئەیانکرد بەناو گیرفانەکاندا،ئینجا دەستماڵەکەش بەسەر ئەوا دەبەست، پاشـان کـۆلوانەکـەشـیـان ئەدا بەسەریاندا، ئیتر لە دواوە مۆدیلێکی زۆر جوان و سەرنجراکێشی هەبوو.

*** وەکو جۆری قوماشەکانی کراس چیبوو؟**

- کـەرەنەک و خـامـەک و گـوورونی گـوڵ باتمان،ئەمـانە بەزۆری بۆ کراس بەکـار دەهات و هەندێ جاریش گوورونی گوڵ باتمانەکە دەکرا بە

کەوا هەروەها سوخمەش هەبوو کە ئێستا پێی دەڵێن ئێلەک شێوەیەکی زۆر جوانی هەبوو وەک ئێستا نەبوو، چونکە گۆڕانکاری بەسەرداهاتووە وەکو مۆدیلێکی کوردستانی تورکیاو ئێران ئێستا لە سلێمانی زۆر باوە.

**بەرێز شیرین مەحموود، لە بارەی جلی خۆماڵییەوە ئاوای وەڵام داینەوە**

*** جلی کوردی چۆن بەکار دەهێنن؟**

- لە راستییدا زیاتر بۆ بۆنەکان بەکاری دەهێنم، لەگەڵ ئەوەشدا حەزدەکەم هەموو کات لەبەری بکەم، لەبەر ئەوەی شێوەیەکی زۆر جوانی هەیەو بە حورمەتترین جلیشی دادەنێم، چونکە هیچ شوێنێکت دەرناکەوێ، کە لەبەردەکرێ لە هەموو شێوەی جلوبەرگی دونیا جوانترە.

*** دەتوانی بەشێوەیەکی کورت لە جۆرەکانی جلوبەرگی کوردی بدوێت؟**

- جۆرەکانی زۆرن، بەڵام باس لە شێوەی لای سلێمانی دەکەم، چونکە پۆشاکی ئێمە جیاوازترە وەک لە شوێنەکانی تر، بۆ نموونە باس لە کراسەکە دەکەم دامێنی کراسەکە چوار پارچەی پێوەیە پێیدەڵێن (تیرێژ) لای ئێمە پێوەی دەدوورێ و کلۆشتر دەبێ، بەڵام لە شارەکانی تری کوردستان وا نیە.

*** جۆری ئەو قوماشانە چین کە بۆ کراس و پارچەکانی تر بەکاردێن؟**

- جۆرەکانی وەکو سورمەی گوڵ قولاپی هەبوو، لەسەردەمی کۆندا کە بۆ ئێلەک و ئاوەڵکراس و کەوا بەکار دەهات، ئەمەیان زۆر بەناوبانگ بوو، هەروەها کرنک هەبوو خامەک هەبوو، جۆری کەش هەبوو، بەڵام من زۆر لەیادم نین.

*** ئەو شتانەی لەگەڵ جلی کوردیدا دەبەستران چی و چی بوون؟**

- کڵاو سەربەست هەبوو چەفتەیان پێدەگوت بەگوڵنگەی زەرد و رەش بەسیم و بە



شیرین مەحموود

گەردە ئەیانچنی و بە گوڵنگەی ورد.

ئەمان لەژێرەوە ئەیان بەستەوە، گوڵنگەکان دوو ریزبوو وەکو لاگیرە بۆیان ئەکرد پیا ئەهاتەخوارەوە لەگەڵ لاگیرەکە ئەیانبەست و لەگەڵ ئەوەشدا سەرپۆشێکی ناسکیان ئەبەست و ئەیاندا بە سەریاندا.

بابزانین **نەزیرە خان** چۆن باسی پۆشاکی کوردەواریمان بۆ دەکات:

*** جلی کوردی لە چەند پارچە پێک هاتووە؟**

- جلی کوردی لە زەمانی کۆندا لە چەند پارچەیەک پێکهاتووە وەک کراس و ئاوەڵکراس و ژێر کراس و سەڵتەو ئێلەک و کەواو چەفتەو سەرپۆش.

هەروەها سەرو بەشیش لە چەفتەی گوڵنگەدار کە ژنانی قەدیم ئەیانبەست لەگەڵ فێستدا واتە (کڵاو) لەسەریان ئەکرد و لەگەڵ ئەوەشدا لاگیرە بەکار دەهات، هەندێ جاریش سەرپۆشێکی ناسکی جوانیان لەسەر ئەکرد لەگەڵ ئەم سەرو بەستەدا.هەروەها جاران دەستماڵێکیان بەکار دەهێنا پێیان دەوت

جامانه، چونکه له قوماشی جامانه بەکاردەهات و ئەو قوماشەش دەکرا بەکراس، هەندێ جار وەکو موتو موری جوانیشیان بەکار دەهێنا لەگەڵ ئاڵتون و زیو ئەیان کرد بە خۆیانەوە و دیمەنێکی زۆر جوان و سەرنجڕاکێشی هەبوو.

*** جۆرەکانی ئەو ئاڵتون و زیوانە چیبوون و ناویان چیبوو؟**

- کەمەرەو هەیاسەو گۆبەرۆک و میخەک و مله شیلان، ئەمانە هەموو بەکاردەهات، لەگەڵ جله کوردییەکاندا شێوەیەکی زۆر جوانی هەبوو.

*** جۆری ئەو قوماشانە کە بەکارتان دەهێنا؟**

- جۆرەکانی زۆر بوون وەکو سورمەی مەلیکی هەبوو زوو کاتی مەلیک، (پۆر سەعید)ئەمەیان بۆ کراس بەکاردەهات و قوماشی گوڵ لیرە و قوماشی شەو هەڵوەریو هەبوو، جۆری ئەم قوماشەش قەیفە بوو زیاتر بۆ ئاوەڵکراس بەکار دەهات لەگەڵ کەوا. کرنک و پەنجەرەی مەلیک، ئەم دوو جۆرەش هەر بۆ کراس بەکاردەهات.

کراسی شێلەش هەر بەکار دەهات و لەبەر دەکرا، بەڵام ئەمەیان هەر زۆر کۆنە.

جلی کوردی لەوەتەی فامم کردبێتەوە هەتا ئێستا دەستماڵ لەگەڵ ئەمجۆرە جله بەکار هاتووەو لە قوماشێکی زۆر تەنک بووەو بۆ زستان قوماشی ئەستووربووە و جۆرێکیکە هەبوو پێیان دەوت جامانەی چاو برۆ، ئەمەش جۆرێکی تری ئەم قوماشانە بوو بۆ جلی کوردی بەکاردەهات.

هەروەها (کەم کرمک)هەبوو وەکو دانتێل بوو سێ جۆری هەبوو یەکەمیان پێیان دەوت کەم کرمک دووەمیان پێیان دەوت دانتێل ئەوەی تریان پێیان دەوت چاو برۆ ئەمەیان لە قوماشی جامانە دروست ئەکرا، ئەمانە هەموو قوماشی دەستماڵ بوون.

*** جۆرەکانی قوماشی چەفتە کامانەن؟**

- سادەی هەیەو قوماشی ئەستووری هەیە، قەیفەی هەیە لەگەڵ ئەوەشدا بۆ دوورینی کەوا جاری وا هەبوو یەک کیلۆ نیو لۆکەیان ئەکردە ناو کەواکەوە، بۆ ئەوەی ئەستوور بێت، زیاتر ئەمە لەکاتی زستاندا بەکار دەهات.

هەروەها چەندین جۆری سورمە هەبوو وەکو حەوت رەنگ و گورونی و گورونی گوڵ هۆقە. کاتێ من مناڵ بووم دایکم گورونیەکی هەبوو دەمگوت بابیکەین بەواڵا بوون دەیوت، چۆن دڵم دێت، ئەم کەوا گورونیە گوڵ هۆقەیە چۆن دەفەوتێنم، بۆیە ئەم نموونەیەت بۆ دەهێنمەوە، چونکە ئەمجۆرە کەوایە زۆر بەناوبانگ بوو.

*** قوماشی کراسەکان لەچی پێک هاتبوون؟**

- قوماشی (هانی هانی و لیالی و ئەتلەس) هەبوو هەروەها بۆ ژێرکراس ئەبوایە قوماشێک بەکاربێت کە لەگەڵ رەنگی کراسەکەدا بگونجایە، جاری واش هەبوو گەنجانی ئەو سەردەمە کە قاتێکی جلی کوردییان دەکرد، هەر پارچەی لە رەنگێک بوو بۆ ئەوەی شێوەیەکی جوانی هەبێت.



نەزیرە خان




ئا: عەباس عەبدوڵلا یووسف

### کوردی کوردینەنووس

نەجمەدین مەلا (١٨٩٨-١٩٦٤) ئا بەم دیدەوە دەڕوانیتە کێشەی ئەو نووسەرە کوردانە، کەوا بە زمانێکی غەیرە کوردی دەنووسن:
پرسیار: زانایەکی کورد بە زمانێکی تر بنووسێت و شعر بڵێ، ئەوە چیە؟
وەڵام: گوایە نایزانێ، ئەو مریشکە هێلکەی مراوێ هەڵدێنێ، جوجەڵەکانی ئەچنە ئاوەوە، خویشی لە وشکی چینە ئەکات.

**تۆژینەوەیەک لە پێنج بەهرەکەی**
**نجم الدین مەلا**

### ئۆباڵ بە ئەستۆی گۆتیارەوە

لەو پێرار ساڵانەدا گێڕایانەوە: کابرایەک هەبوو، رەسەنی گشت وشەیەکی دەبردە سەر زمانی کوردی، بەتایبەت ناوی شارو دەوڵەتان لەوانە: (ئەمەریکا = ئەمە رێگا) (ئەسکەندەناڤیا = ئەز کەتمە ناڤێ) (کەنەدا = کەند) (تورکیا = تەڕکێو) (مەکە = مەیکە) (مەدینە = مەیدینە).
(توونس = توونی زێ-رەنگە" توونی سە بێت") (دیمەشق = دێی مشک)




هزروەرێکی ئەمریکی کە بەرەچەڵەک چینییەو ناوی (لین یوتانج)ە، لە کتێبیکەی خۆیدا بە ناونیشانی (مرۆڤ چۆن دەژی) بەراوردێک لەنێوان مرۆڤ و گیانلەبەران دەکات و لە ئەنجامدا، گەورەیی و شیاوی بە مرۆڤ دەبەخشێ و دەڵێ ئەگەر کەسێک لێم بپرسێ: مادامەکی هەر پێ دادەگری کەوا ئێمە لە ئاژەڵەکانین، پێت وایە مرۆڤ لە هەموو گیانلەبەران سەرنجڕاکێشترە؟ ئەوا بەرەزامەندی وەڵام دەدەمەوە:

مرۆڤ خاوەن شارستانیەتە، ئەگەر هەندە ئاژەڵ بە وێنەو روخسار لە مرۆڤ جوانترن وەک ئەسپ و ماین، لە مرۆڤ بە هێزترن وەک شێر، بە بۆنکردن تیژترن یا ئەمەکدارترن وەک سەگ، یا بینینیان تیژترە وەک باز، یا باشتر رووگە دەدۆزنەوە وەک کۆتری (زازل)، یا هەوڵ و کۆشش و خۆپەیتی و بارگەگرتنی کاریان زیاترە وەک مێروولە یا مگێزیان نەرم و نیان و خۆشترە، وەک مامز یان کۆتر، یان ئارامترن و زێدە بارگە گرن وەک چێڵ و گامێش، یا دەنگیان بە جۆشترە وەک بولبول یان پۆشاکیان جوانترە وەک تاوس و بەبەغا.




### فرانز کافکا و نووسینکاری

بەرنامەی نووسینکاریی رۆماننووس فرانتس کافکا (١٨٨٣-١٩٢٤) بەم شێوەیەیە:
پاش دابڕانێکی درێژ، کە دەست بە نووسین دەکەمەوە، وەک ئەوە وایە وشە لە بۆشایی هەڵبکرێنم، هەرکە وشەیەکم دەست کەوت، ئەوا سەر لە نوێ نووسینکاریم دەست پێ دەکاتەوە.

### قاوە

هەندە جار
پێویستمان بە قاوەی تاڵ هەیە
تا بتوانین بژین

**ئەمەل جەمال**
**شاعیری هاوچەرخی میسر**

### ئۆرووپی و ئیتقاتی میللی

وا مەزانە هەر ئێمەی رۆژهەڵاتی بڕوامان بە ئیتقات و پڕوپووچی پێشینیان هەیە، ئەوەتا ئۆرووپییەکان پێشترو کەم کەمە تا ئەوڕۆش بڕوایان پێ ماوە، بەنموونە:
دەڵێن: هەر کەسێ بەبێ زین سواری پشتی هێستر ببێت ئەوا تووشی نەزۆکی دەبێت، چونکە هێستر خۆی نەزۆکە.
دەڵێن:
- هەر کەسێ تف لە ئاگر بکات، ئەوا تووشی (تا)یەک دەبێت کە بەهیچ نوشتەیەک چاک نەبێتەوە.

### قسەی نائەستەق

* دیواربەگوێییە، دەرگە بەلووتە، پەنجەرەش بەچاوە.
* شوفێرێک دەڵێ:
-گوند ئەوەی باشە، هەموو کەس یەکتر دەناسن، شاریش ئەوەی باشە، کەس کەس ناناسێت

### ئابوونە!

لەم رۆژادا کە تەنگوچەڵەمەی چاپ لە هەموو شت زۆرترە، ئەم گۆڤارە هەمووجار لە وەختی خۆیا بە رێکوپێکی دەرچووە و گەیشتۆتە دەستتان.
مایەوە سەر ئەوە ئایا یەکێ بەدڵیا نایە بڵێت: ئەمە چۆن دەرئەچێ و بەچی دەرئەچێ؟ لام وایە هەموو کەس ئەوە ئەزانێ کە رۆژنامەچیەتی لەم رۆژەدا بەتێکڕا لە زەرەر بەولاوە هیچی تری لێوە دەست ناکەوێ بە تایبەتی لای ئێمە!
بڕوا بکەی یا نەیکەی، تا ئێستا ئەوەندە زەرەرمان تێدا کردووە کە بە فرۆشتنی خۆشمان پڕنەکرێتەوە.
مایەوە سەر ئێستە، ئێستەش تکا ئەکەین زوو بەزوو ئابوونەکەمان بۆ بنێرن، تا بتوانین ئیش بکەین.

**گۆڤاری نزار**
**ژمارەی ١٠-لە١٥ی ئاب ١٩٤٨**



# بەردەرگا

## وێستگەیەکە بۆ شیکردنەوە و سازدانی دوا هەواڵی کۆمەڵایەتی و سیاسی

ئا/ن. شیرین

**پەیوەندیە کۆمەڵایەتییەکان لە خێزانێکەوە بۆ خێزانێکی تر جیاوازییان هەیە.**

لە سەرووی ئەوەش پەیوەندی و جموجۆڵەکان، لە نێوان (نێر و مێ) دا جیاوازیان هەیە بۆ ئەمەش ژینگەی خێزانەکان کاریگەرییان لەسەر ئەم پەیوەندیانە هەیە، عەلی عوسمان دەڵێت: (دانیشتنی ئافرەت بە شێوەیەکی بەردەوام لە بەردەرگا، شتێکی زۆر ناشرینە، بۆیە ناهێڵین بە بەردەوامی ئافرەتەکانمان لە بەردەرگا دابنیشن) لێرەوە گۆڕانکاری لە بۆچوونی کەسەکاندا هەیە، بۆیە گۆڕانکاری زۆر و جیاواز لە رەفتار و جۆری کات بەسەر بردنەکانیشدا دەبیندرێت، جا لەسەر ئەم حاڵەتە بۆچوونی ئەو ئافرەتانەمان وەرگرت کەوا لە بەردەرگا دادەنیشن:

**زولەیخا محەمەد**، ئافرەتێکی تەمەن (٧٠) ساڵانە، گەورەیی تەمەنی وای کردووە زۆر بیربکاتەوە و کێشەکان زۆر لێکبداتەوە، ئێستاش بە هۆی ئەوەی منداڵەکانی

**ئافرەتێک:**
**زۆرجار بە بەلاش و بێ هیچ هۆیەک لە بەردەرگا دادەنیشم.**

**ئافرەتێکی تر:**
**ئەو ئافرەتانەی بەردەوام لە بەردەرگا دادەنیشن نیشانەی ئەوەیە کە بۆشاییان هەیە لە نێو خێزانەکەیان...**

گـەورە بوون و هەر یەکـێکیـان بە ڕێگای خۆیاندا ڕۆیشتوون، بۆیە لەگەڵ گوڵستانی دراوسێیدا خەمەکانیان بەشدەکەن و زولەیخا دەڵێت: من و گوڵستان ماوەی (٢٦) ساڵ دەبێت دراوسێی یەکترین بۆیە هەر کاتێک کە هەر یەکێکمان دڵتەنگ دەبین، دێینە لای یەکترو لە بەردەرگا دادەنیشین، باسی ئەو شتانە دەکەین کە لە تەلەفزیۆندا دەیبینین و ئیتر باسی هەواڵ و خۆشی و ناخۆشییەکانی یەکتر دەکەین لەگەڵ هەموو ئەو شتانەی کە ئەمڕۆ لە کوردستاندا باس دەکرێت بە تایبەت ئەو کوشتن و بڕینانەی کە لە تەلەفزیۆندا پیشان دەدرێت، ئێمە دوو هاوڕێی کۆنی یەکترین و ساڵانێکی زۆرە بە یەکەوە لە بەردەرگا دادەنیشین و زۆرجار وا ڕێک دەکەوێ کچەکانیشمان لەگەڵماندا دادەنیشن، زۆر کات خۆم و پیاوەکەم بەتەنیا لە ماڵەوە دەمێنینەوە، بەڵام بە پیاوەکەم دەڵێم دڵم تەنگە، بۆ خۆت بە تەنیا لە ماڵەوە بمێنەوە و من بۆ خۆم دەچمە بەردەرگا و لەگەڵ جیرانەکان دادەنیشم.

**کافیە ئیبراهیم**، ئافرەتێکی بە تەمەنە و ڕۆژانە لەگەڵ دراوسێکانیدا لە بەردەرگا دادەنیشێت، بەڵام لەگەڵ ئەو دراوسێیەی (٢٠) ساڵ دەبێت بە یەکەوەن زیاتر دادەنیشێت و دەڵێت: (زۆر جار بە بەلاش و بێ هیچ هۆیەک لە بەردەرگا دادەنیشم و زۆرجار کە منداڵەکان بە یەکەوە گاڵەگاڵ دەکەن و شەڕ دەکەن، چونکە نەخۆشیم هەیە و دڵم تەنگ دەبێت و دەچمە دەرەوە ئەگەرچی هەندە جار وا ڕێک دەکەوێ کە ئیش و کاریشم زۆر دەبێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەچم دادەنیشم و لەگەڵ دراوسێکان بە یەکەوە هەموو لە بەردەرگای ئێمە دادەنیشین، دەڵێی (مەقەڕە) بەڵام دواتر پیاوەکەم وتی عەیبە، بۆیە ئێستا زۆربەی کات لەگەڵ (ئاسکە)ی



دراوسێی و هاوڕێمدا دادەنیشم، زۆرجار دراوسێکان لەگەڵم لەناو باخچەی ماڵەکەم دادەنیشین، قسەی بەردەرگای ئێمەش ئەوەیە دەڵێین خۆزگە ئەوەمان هەبووایە و ئەگەر مووچە وەربگرین فڵانە شتی پێ دەکڕین، بۆیە زیاتر باسی خۆمان و ژن هێنان و مێردکردن دەکەین، بەڵام ئەوەمان زۆر باشە قەت باسی خەڵکی ناکەین و توانج لەو کەسانە ناگرین کە بە بەردەرگادا تێدەپەڕن و زۆرجار بە دراوسێکانم دەڵێم خۆزگەی بە خەڵکی ئێستای شار، چونکە من کاتێک کە مێردم کرد لە گوند منیان بە شەو گواستەوە، بۆیە زۆربەی قسەکانم دەربارەی ئەو جۆرە شتانەن تا وەکو ئێستا هیچ ناخۆشییەک لە نێوانماندا نەبووە.

**ئامینە نووری سادق**، ئافرەتێکی گەنجە و خاوەن بڕوانامەیە و چەند منداڵێکی بچووکی هەیە، بۆیە کاتێک کە بێ تاقەت دەبێت لەماڵەوە بۆ خۆی لەگەڵ دراوسێکانی لە بەردەرگا دادەنیشێ کە لەڕووی تەمەنەوە جیاوازی لە نێواندا هەیە و دەڵێت: (کاتێک کە ئیش و کارەکانی ماڵەوە جێبەجێ دەکەم،

پێم خۆشە لە بەردەرگای دراوسێکەم یان دوو هاورێی باش ببینم و کاتێکی خۆش بەرینەسەر بەوەی باسی کێشەی ماڵ و ئافرەت دەکەین و گوێ لە قسە خۆشەکانی یەکتر دەگرین و زۆر دڵخۆشین بەیەکەوە و گرفتمان نییە، زۆرجار نەبوونی شتێک لە ماڵەوە کە خۆی پێوە بخافڵێنی وات لێدەکات لە ماڵ بێیتە دەرەوە بۆ نموونە کارەبا نەبێت لە ماڵەوە خۆت پێ ناگیرێت، لەهەمان کاتدا هەموو ئافرەتێک ناتوانێت بێتە دەرەوە بە تایبەت گەر پیاوەکەی لە ماڵ بێ، ناتوانیت ئەو بە جێ بێڵێت، بەردەوام لە بەردەرگا دانیشتن لەماڵ بۆشاییەک دروست دەکات، چونکە بەبێ کەس دەمێنیتەوە، کەس نابێت ئاگاداری ماڵ بکات لە هەمان کاتدا کار لە پەروەردەی منداڵەکان دەکات، چونکە وات لێدێت کە نەتوانیت چاودێری بکەیت، لە هەمانکاتدا کەسی وا هەیە کە دێتە بەردەرگا قسەی دراوسێکانی تر کار لە پەیوەندی نێوان خۆی و پیاوەکەی دەکات و وای لێدێت دەست لە کاروباری



هەموو ئەو خەڵکانە وەردەدات کە بە بەردەرگادا تێدەپەڕن، بۆیە دانیشتنی زۆر لە بەردەرگا کار لە کەسایەتی ئافرەتەکان دەکات).

**شوکریە مەحموود عەلی**، ئافرەتێکی زۆر گەنجە و زۆربەی کات لەگەڵ (ئامینە) لە بەردەرگا دادەنیشێت و دەڵێت: من دێمە بەردەرگا، بەڵام بە شێوەیەکی زۆر کەم، ئەو ئافرەتانەی بەردەوام لە بەردەرگا دادەنیشن، نیشانەی ئەوەیەکە بۆشاییان هەیە لە نێو خێزانەکە یاخود ناچارە بێتە بەردەرگا، چونکە منداڵی هەیە و دێتە دەرەوە بۆیە ئەگەر خۆی لەگەڵی نەبێت و چاودێری نەکات، ئەگەری ئەوەی هەیە منداڵەکەی شەڕ بکات یاخود ئەو ئافرەتانەی کە پێشتر لە گوند بوونە، چونکە فێرە کاری کشتوکاڵی و چۆڵەوانیش، ئێستا ناتوانن لە ماڵەوە خۆیان بگرن و بەردەوام لە ماڵەکەیان دانیشن.

دانیشتن لە بەردەرگا سوودی هەیە بۆ ئەوەی دراوسێکەت بناسیت و بزانیت چ جۆرە کەسێکن، لە راستیدا دانیشتنی ئافرەت لە بەردەرگا شتێکی جوان نییە سەرەڕای ئەوەش شوێنێک نییە کەسێک تیایدا بحەوێتەوە، پیاویش کاریگەری زۆری لەسەر ئەم حاڵەتە هەیە، چونکە جاری واهەیە کە پیاوەکە لەکار دەگەڕێتەوە ماڵەوە، کاتێک تەرخان ناکات بۆ ئەوەی لەگەڵ ژنەکەی بێت بۆیە ژنەکەش بێزار دەبێت و ناچار دێتە بەردەرگا و لە کۆڵان دادەنیشێت.

**ناهی کەریم فەرەج**، ئافرەتێکی بە تەمەنەو پێی خۆشە لەگەڵ دراوسێکانیدا لە بەردەرگا دابنیشێت، چونکە واهەست دەکات لە ماڵەوە دڵی تەنگ دەبێت و هەموو ناخۆشییەکانی ژیانی بیر دەکەوێتەوە و دەڵێت: (زۆربەی کات لەگەڵ باجی قەدری دراوسێمدا دادەنیشم ئەوەش بە پێی کات، چونکە هیچ شوێنێکی تر

نییە بۆی بچین، بۆیە ئەگەر لە گەڕەکەکەمان باخچەی گشتی هەبێت، ئەوا دەتوانم دەستی منداڵەکانم بگرم و لەگەڵیاندا بڕۆم. سەرەڕای ئەوەی کە (CD) و سەتەلایت هەیە، بەڵام ئارەزوو ناکەم تەماشایان بکەم و کاتەکانی خۆم بەوانەوە بەسەربەم، بۆیە لەگەڵ ئەو دراوسێیەی کەوا (١٠) ساڵە بە یەکەوەین زۆر دڵخۆشتر و بار سووکتر دەبم کە قسە بە یەکەوە دەکەین).

**مریەم عومەر سلێمان**، تەمەنی (٨٨) ساڵ دەبێت، کە بێزار دەبێت لەماڵەوە دێتە بەردەرگا و لەگەڵ منداڵ و نەوەکانی خۆی دادەنیشێت یاخود لەگەڵ (بەدریە حامد)ی دراوسێی دادەنیشێت و دەڵێت: (کە دێمە بەردەرگا لەبەر ئەوەیە ئاگاداری منداڵی کوڕەکانم بم و دڵتەنگیم کەم بێتەوە، چونکە لەگەڵ بەدریەی دراوسێمدا باسی کۆن دەکەم و دەڵێین کە ئەو کات چەند جیاوازبوو لەگەڵ ئێستادا و باسی ئەو خواردنە کۆنانەی زەمانی کۆنی بۆ دەکەم و هەست دەکەم ئەو لە گەنجەکان زیاتر گوێم لێ دەگرێت، چونکە گەنجەکان پێم دەڵێن ئەو پەڕەی وەرگێڕە ئەو باسانە بەسەر چوو).

**عەلی عوسمانی کوڕی مریەم دەڵێت:** دانیشتنی ئافرەت بە شێوەیەکی بەردەوام لە بەردەرگا زۆر ناشرینە، بۆیە ناهێڵین بە بەردەوامی ئافرەتەکانمان لە بەردەرگا دابنیشن، چونکە ئەگەر ئافرەت زۆر لە بەردەرگا دابنشێت تەداخول بەکاری دراوسێکان دەکات و کار لە پەروەردەکردنی منداڵەکانیش دەکات، بۆیە ئەگەر (ئەدیبە)ی خێزانم زۆر لە بەردەرگا دابنیشێت پێم ناخۆشە، چونکە باشتر وایە دانیشتنەکان کەمێک گونجاو بن.

بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی رووە کۆمەڵایەتی و هۆکارو دەرەنجامەکانی دانیشتنی ئافرەت لە بەردەرگا ، م. هەتاو کەریم خضر مامۆستای یاریدەدەر لەبەشی کۆمەڵناسی زانکۆی سەلاحەدینمان دواند و دەربارەی ئەم حاڵەتە چەند پرسیارێکمان لێکرد.

*** کاتێک کە ئافرەت لەماڵ دێتە دەرەوە تاچەند بۆشایی لەکاری ماڵ و ناوخێزانەکەی دروست دەکات؟**

- بەر لە هەموو شتێک دەتوانین بڵێین دانیشتن لە بەردەرگا و کۆڵاندا دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە، زیاتر تایبەتە بە کۆمەڵگەی کوردی و زیاتریش لە گەڕەکە میللیەکاندا باوە بە بەراورد لەگەڵ گەڕەکە دەوڵەمەندەکان یان خۆشگوزەرانەکان.

لێرەدا گەر تەماشای ئەم دیاردە کۆمەڵایەتییە بکەین، کە ئەویش دانیشتنی کۆمەڵێک ئافرەتە لە بەردەرگای یەکێک لەماڵەکاندا ئینجا دەستکردن بە قسە و قسەڵۆک و بنێشت خواردن و تیر و توانج گرتن لەو خەڵکانەی کە هاموشۆی ئەم شوێنە دەکەن، ئەمەش خۆی لە خۆیدا دیاردەیەکی نێگەتیڤی کۆمەڵایەتییە، چونکە چەندەها کێشە و گرفتی کۆمەڵایەتی و دەروونی بە دوای خۆیدا دەهێنێت، یاخود دروست دەکات، گەر لەسەرەتاوە لەو کێشانە بکۆڵینەوە کە دێتە ئاراوە لەناو خێزانی هەر یەکێک لەو ئافرەتانە دەبینین ئەو ئافرەتانە چەندەها کاریان هەیە لە



ژووره‌وه‌ چ سه‌باره‌ت به‌ ناومالّ و پاک و خاوێنی بێت یاخود چێشت لێنان بێت که‌ له‌ ئه‌نجامی ئه‌و دانیشتنه‌دا ئه‌م کارانه‌ هه‌موویان به‌سه‌ر یه‌که‌وه‌ که‌ڵه‌که‌ ده‌بن و له‌ شوێنی خۆیاندا ده‌مێننه‌وه‌ ئه‌مه‌ش ده‌بێته‌ هۆی دروست بوونی پیسایی له‌ناو ماڵه‌که‌دا ئه‌مه‌و جگه‌ له‌وه‌ی که‌ منداڵه‌کان پشتگوێ ده‌خرێن له‌ لایه‌کی تره‌وه‌ په‌روه‌رده‌کردنی منداڵ پێویستی به‌ چاودێری به‌رده‌وام و به‌خشینی خۆشه‌ویستی و سۆز هه‌یه‌، سه‌ره‌ڕای ئه‌وه‌ش منداڵه‌کان ده‌که‌ونه‌ ژینگه‌ی کۆڵانه‌وه‌ و تێکه‌ڵ به‌ منداڵانی تر ده‌بن له‌ ئه‌نجامی ئه‌مه‌شدا تووشی لادان و فێری ره‌فتاری ناشرین ده‌بن. له‌سه‌رووی هه‌موو ئه‌مانه‌شه‌وه‌ کاتێک که‌ هاوسه‌ره‌که‌ی روو له‌ ماڵه‌که‌ی ده‌کات چاوه‌کانی به‌و هه‌موو گیرو گرفتانه‌ ده‌که‌وێت که‌ له‌وانه‌یه‌ هه‌ڵچوونێک له‌لای پیاوه‌که‌ دروست ببێت.

*** بۆچی ئافره‌ت ماڵ به‌جێ ده‌هێڵێت و زۆربه‌ی کاته‌کانی له‌ به‌رده‌رگا دا به‌سه‌رده‌بات؟**

- بێ گومان چه‌نده‌ها هۆکار هه‌ن پاڵ به‌ ئافره‌ته‌وه‌ ده‌نێت بۆ ئه‌وه‌ی روو له‌ به‌رده‌رگا بکات له‌وانه‌:

١. حه‌زی زانین و خۆ تێهه‌ڵقورتاندن (الفضولیة): هه‌ندێک ئافره‌ت هه‌ن حه‌ز به‌ زانینی هه‌موو شتێک ده‌که‌ن که‌ له‌ ده‌وروبه‌ریاندا روووده‌دات.

٢. بوونی کێشه‌ و گرفتی خێزانی، که‌ ئه‌مه‌ش وا له‌ ئافره‌ته‌که‌ ده‌کات روو له‌ به‌رده‌رگا بکات بۆ ئه‌وه‌ی که‌مێک له‌ کێشه‌ و گرفته‌کانی یاخود خه‌مه‌کانی له‌ بیر خۆی بباته‌وه‌.

٣. شووکردنی ئافره‌ت به‌بێ ره‌زامه‌ندی خۆی: ئه‌مه‌ش هۆکارێکه‌ پاڵ به‌ ئافره‌ته‌که‌وه‌ ده‌نێت له‌ به‌رده‌رگا دابنیشێت، چونکه‌ دڵی خۆش نییه‌ به‌ خێزان و هاوسه‌ره‌که‌ی و هیچ کاتێک ئه‌و هاوسه‌ره‌ی خۆش نه‌ویستووه‌ و خۆشی ناوێت، بۆیه‌ هیچ هه‌ست به‌ به‌رپرسیارێتی ناکات به‌رامبه‌ر به‌ ماڵه‌که‌ی.

٤. بێکاری، وا له‌ ئافره‌ت ده‌کات روو له‌ قسه‌ و گفتوگۆ و به‌رده‌رگا و کۆڵانه‌کان بکات.

٥. نه‌خوێنده‌واری: ئه‌گه‌ر ته‌ماشای گه‌ڕه‌که‌ میللییه‌کان بکه‌ین، ده‌بینین زیاتر ئه‌وانن ئافره‌ته‌کانیان له‌ به‌رده‌رگا داده‌نیشن، زیاتر ئه‌و ئافره‌تانه‌ن که‌ نه‌خوێنده‌وارن یاخود ئاستی رۆشنبیریان نزمه‌.

٦. بوونی بۆشاییه‌ک له‌ نێوماڵدا: لێره‌دا مه‌به‌ستم دوو بۆشاییه‌، یه‌که‌میان هه‌بوونی بۆشایی سۆزدارییه‌. دووه‌میان بۆشایی ماددییه‌، واته‌ دابین کردنی هه‌موو پێداویستیه‌کانی ناوماڵ و که‌ره‌سته‌کانی وه‌ک (TV) سه‌ته‌لایت ئافره‌ت سه‌رقاڵ ده‌کات و به‌ ماڵه‌که‌یه‌وه‌ خه‌ریک ده‌بێت.

٧. نه‌بوونی شوێنێک بۆ ئه‌وه‌ی ئافره‌تان رووی تێ بکه‌ن، چ له‌ رووی چاره‌سه‌رکردنی گیرو گرفته‌کانیان و چ له‌ رووی خۆش کاتییه‌وه‌.

*** ئه‌م دانیشتنه‌ به‌رده‌وامه‌، چ کاردانه‌وه‌یه‌کی به‌سه‌ر په‌یوه‌ندییه‌ کۆمه‌ڵایه‌تیه‌کانی ده‌ره‌وه‌ ده‌بێت؟**

- ئه‌مانه‌ هه‌مووی کاردانه‌وه‌ی زۆر نێگه‌تیڤانه‌یان ده‌بێت له‌سه‌ر په‌یوه‌ندیه‌ کۆمه‌ڵایه‌تیه‌کان، چونکه‌ له‌ لایه‌ک په‌یوه‌ندی ئه‌و ئافره‌تانه‌ به‌ ماڵه‌وه‌ زۆر بێ هێز ده‌کات به‌ تایبه‌ت له‌گه‌ڵ هاوسه‌ر و منداڵه‌کاندا. له‌ لایه‌کی تریشه‌وه‌ په‌یوه‌ندیه‌کانی ئه‌م ئافره‌تانه‌ له‌گه‌ڵ دراوسێکاندا، له‌وانه‌یه‌ له‌ ئه‌نجامی ئه‌م دانیشتنه‌دا چه‌نده‌ها بیرو بۆچوونی جیاواز بێته‌ ئاراوه‌ و ببێته‌ هۆکارێک که‌ گرفت له‌ نێوانیان دروست بێت و زۆر بچنه‌ نێو قووڵایی گرفته‌کانی یه‌کتره‌وه‌ که‌ له‌ ئه‌نجامدا گرفت بۆ خۆیان و خێزانه‌کانیان دروست ده‌بێت.

# گەڕان بەدوای نهێنی لاویەتیدا




زۆربەی کتێبە ئاسمانیەکان ئاماژە بەوە دەکەن کەوا تەمەنی مرۆڤی کۆن دەگەیشتە دەوروبەری (١٠٠٠)ساڵ،باشە چ گۆڕانێک لە چەرخی تازەدا روویداوە تا رێژەی تەمەنی ئادەمیزاد لە (٦٠)ساڵ تێپەر نەکات. ئایا گوشاری سەردەمە کە چەندین نەخۆشی سەیری داهێناوە، یا جۆری خواردەمەنیەکانە کە مرۆڤ بە درێژایی مێژوو بەکاریان دەهێنی. یاخود ئیرادەی پەروەردگارە تاوەکو ژیان و ژمارەی مرۆڤەکان لەسەر گۆی زەوی بەشێوەیەک بێت لەگەڵ سەرچاوە سروشتیەکاندا بگونجێ. دیارە خۆشترین خەوو گەورەترین ئامانجی مرۆڤ ئەوەیە، هەر بە لاوی بمێنێتەوە و پیری و بێهێزی نەبینێ و نەخۆشی هەرەسی پێ نەهێنێ، بەڵام ئایا دەکرێ ئەو خەونە بێتە دی و مرۆڤ هەموو توانا هزری و ماسولکەیی و سێکسییەکانی وەکو خۆی بمێنێتەوە و بە ساڵاچوونی پێوە دیار نەبێ؟

زانایانی زانستی بۆماوەیی و جینەکان بەبەردەوامی بەدوای ئەو جیناتانەدا دەگەرێن کە پەیوەندیان بەپیربوونەوە هەیە تاوەکو بە هۆیەوە رێگا لەو دیاردەیە بگرن و یاری بە ژیانی سروشتی مرۆڤەوە بکەن. دووریش نیە ببێتە هۆی روودانی چەندین جۆرە کارەساتی تازە. دیارە زانست هەرگیز ناتوانێ مردن رابگرێ بەڵام دوای دەخا و زانایان گەیشتونەتە ئەو ئەنجامەی کەوا نهێنی لاویەتی بەردەوام لە گلاندێکی بچووکدایە لە مێشکی مرۆڤدا،ئەو گلاندەش تا ساڵانی(٢٠-٢٥)ساڵی هۆرمۆنیک دەردەکا بەناوی هۆرمۆنی

گەشەکردن Growing Humans Hormon کە بە (H.G.H) ناسراوە و لێپرسراوی سەرەکی گەشەکردنی لەش و ئەنجامدانی ئەرکەکانی زاوزێ کردنە ،بەڵام ئەم هۆرمۆنە لەدوای تەمەنی(٢٠)ساڵی رووەو دابەزین دەکات، ئەو گلاندە لە تەمەنی (٢٠)ساڵیدا رێژەیەکی زۆر کەم دەردەکا (هەرچەندە بەرزترین رێژەشە)و خۆی لە (٥٠٠)مایکرۆگرام دەدا لە



رۆژێکدا هەرچەندە زانایان دەیسەلمێنن کەوا کەمی هۆرمۆن هەر تەنها پەیوەندی بە بەساڵدا چووندانییە ،بەڵکو خواردنی خراپ و گرژی بەردەوامی دەمارەکان و بارودۆخە ژینگەییەکان هەر هەموویان هاوسەنگی مرۆڤ تێکدەدەن و پیربوونی پێش وەختە بەرپادەکەن. ئەو گلاندەش دوای تەمەنی(٦٠)ساڵی(٨٠٪)ی توانای بەرهەمهێنانی هۆرمۆنەکەی کەم دەبێتەوە زاناکانیش توانیان هەندێک لەو هۆرمۆنە لە تەرمی مردووەکاندا دەربکەن و بیخەنە لەشی مرۆڤی ساخەوە کە چەندین ئەنجامی سەرسوڕهێنەری لێ کەوتۆتەوە. دووریش نییە لە ئایندەیەکی نزیکدا بتوانرێ هۆرمۆنی(H.G.H)بەرهەم بهێنرێ، دوای زانینی پێکهاتە کیمیاویە ئۆرگانییەکەی کە لە (١٩١)ترشەلۆکی ئەمینی پێک دێت و تا ئێستاش لە رێگای دەرزی لێدان یاخود وەکو کەپسوو لە رێگەی دەمەوە بەکار دەهێنرێ هەرچەندە کێشەی سەرەکی ئەو جۆرە دەرمانە ئەوەیە کەزۆر گرانەو نرخەکەی دەگاتە (٣٥٠٠٠)دۆلار لەساڵێکدا.

کەواتە هەروەک روون بۆوە مرۆڤ گەیشتە ئەو رادەیەی چارەسەرێک بۆ پیربوون بدۆزێتەوە و گەنجێتی بپارێزێ،زانایانیش لەسەر ئەوە کۆکن کەوا گەڕان بەدوای چەند چارەسەرێکی خۆراکی هانی گلاندەکە دەدا هۆرمۆنی زیاتر دەربکاو ئەم رێگایەش زۆر لە چارەسەرکردنی دەستکردو داوو دەرمان بەکەڵک ترە.

لەدوا لێکۆڵینەوەی زانستیشدا هاتووە کەوا ئەو کەسانەی زوو پیر دەبن هۆی سەرەکییەکەی بێهێزی گلاندەکانە لەبەرهەم هێنانی هۆرمۆنی H.G.H دا دوای چارەسەری بە هۆرمۆنیش بۆ ماوەی (٦)مانگ رێژەی پیربوون بەرادەی (١٠)ساڵ کەم بۆتەوە. پاش دۆزینەوەی ئەم چارەسەریە گرینگەو ئەو پێشکەوتنە پزیشکیە گەورەیە پرسیارێک لێرەدا سەرهەڵدەدا ئەویش ئەوەیە ئایا چی رووددەدا ئەگەر زانایان بەتەواوی توانیان پیربوون رابگرن و هەموومان هەر بەگەنجی ماینەوە؟! پاشان چی روودەدا ئەگەر کۆمەڵگا هەرهەمووی لەیەک تەمەندا بوون و ئەمەش پرسیارێکی گرینگەو لەوانەیە وەڵام دانەوەی ئەوەندە ئاسان نەبێ یاخود هەرهیچ نەبێ کەس نەبێ بەم دەمو دەست و پەلەکردنە وەڵامی بداتەوە وترسی کۆمەڵناسان بڕەوێنێتەوە.

دە کەواتە با چاوەڕوان بین بزانین پێش کەوتنە زانستیەکان بەچی دەگەن و چارەنووسی ئێمەی مرۆڤیش بەچی دەگەیەنن!!





# کەنیسەکانی کوردستان
# خواپەرستی و برایەتی و ئاشتی و لێبوردەیی

**شوێنەکانی خواپەرستی، پەرستگایەکن بۆ پاککردنەوەی دڵ و دەروون،**
**لەوێ... مرۆڤ رووبەڕووی خوای خۆی دەبێتەوە.**



لە جێی ئەوها ئەگەر مزگەوتە، ئەگەر کلێسەیە، یا هەر جۆرە پەرستگەیەک بێت، خەڵکی ئیماندار فێرە وانەکانی راستگۆیی و لێبوردەیی دەبن و بەرەو بەها بەرزەکانی ئاسمان هەنگاو دەنێن.

خاکی کوردستانی ئێمەش بەپاک رەفتاری وا، دەکەوێتە بەر رووناکیەکی پیرۆز و لە ئاشتیەکی بەردەوام ژیان بەسەر دەبات.

رژێمی فاشیستی لە پرۆژەیەکی سامناکدا، مزگەوتەکانی رووخاند، کلێسەکانی تێکدا، دەیویست بەزەبری ئاگر، ئیمان بخاتە ئێو ئایدۆلۆژیایی زاڵبوونی خۆیەوە.





ئەمڕۆ لە کوردستانی ڕەنگین دا، ڕێز لە هەموو ئایین و مەزەب و تایفە گیراوە و ئەوانە زۆر بە ئازادی تقووسی ئاینییان بەرێ دەکەن.

حکومەتی هەرێمی کوردستانیش لەپاڵ بایەخە گرنگەکانی بە توێژەکانی میللەت، بایەخێکی تەواو بە تێکڕای ئایین و تایفە ئایینیەکانی کوردستان دەدات و لەم بوارەدا برا مەسیحییەکان بە تەواوەتی مافەکانی خۆیان پەیڕەو دەکەن و بەشداری دەکەن لە سازدانی ژیانێکی شیاوتر بە کۆمەڵگەی کوردستان و لەسەر بنەمای خۆشەویستی و لێبوردەیی و پاراستنی مافی ئەوانی تر.



# موڕەبای پرتەقاڵ و لیمۆ










## کەرستە پێویستەکان

أ- یەک کیلۆ پرتەقاڵی گەورە.
ب- یەک دانە لیمۆی گەورە
ت- یەک کیلۆ شەکر.

(١) دوای سپیکردنی پرتەقاڵ و لیمۆیەکە، تفرە سپییەکەی سەر پەلکی پرتەقاڵەکە لێکەوە.

(٢) پەلکە پرتەقاڵ و لیمۆیەکە بە شێوەیەکی یەکسان کووز کووزی باریک بکە.

(٣) پرتەقاڵ و لیمۆیە سپیکراوەکە لە ناوەڕاستەوە بکە دوولەت و لەناو دەفرێک، یان بە دەزگای کوشین، جوان بیکوشە و سرپاتەکەی لە لایەک دابنێ.

(٤) کوشراوی پرتەقاڵ و لیمۆیەکە لەگەڵ پەلکە پرتەقاڵ و لیمۆیەکە تێکەڵ بکەو سرپاتەکەش لەناو بوخچەیەکی بچووک بکەو هەموویان بخەناو مەنجەڵێکی گەورە.

(٥) لیتر و نیوێک ئاوی تێکە و بیخە سەر ئاگر تا دەکوڵێ و ئاوەکەی چک دەکات، پاشان بوخچەکە بکوشەو دەری بێنە و شەکر لە مەنجەڵەکە بکەو لەسەر ئاگرێکی کز بیکوڵێنە، پاشان کەمێکی لەناو دەفرێک بکەو تاقی بکەوە بزانە بووەتە موڕەبا.

(٦) لە کۆتاییدا موڕەبایەکە لە خڵت وسرپاتەکان بە هۆی پارزونگ بپارزنە و لەناو شووشەی پاک و خاوێنی بکەو جوان سەرەکەی قەپات بکە.









# رەشکە

و-ئا: عەبدولئیلاه تەوفیق ئەبوبکر

رەشکە (حبة البركة- Black Cumin) (Nigella Sativa) بە یەکێک لە گرنگترین تۆوەکان دادەنرێ لە مێژوودا و باشترین جۆریشی لە میسرەوە دێت، چونکە لە مێرگەکانی میسردا کەش و هەواو مەرجی گونجاو هەیە بۆ رواندانی، هەرچەندە لە ناو پەرتووکی پیرۆزدا و (Bible) لە لایەن پێغەمبەرەوە دروودی خوای لەسەر بێت باس کراوە، هەتا نزیکەی (٤٠) ساڵ لەمەو پێش توێژینەوەی وردی لەسەر ئەنجام نەدرابوو، بەڵام لەو کاتە بەدواوە لە زانکۆکاندا زیاتر لە (٢٠٠) لێکوڵینەوەی لەسەر ئەنجام دراوە.

پزیشکی یۆنانی بەناوبانگ (Dioscordies) رەشکەی بەکار هێناوە بۆ چارەسەرکردنی سەرئێشە و دانێشە.

پێغەمبەر دروودی خوای لەسەربێت فەرموویەتی: رەشکە چارەسەری هەموو نەخۆشیەک دەکا جگە لەمردن هۆیەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە تۆوی رەشکە پێکهاتەیەکی کیمیاوی ئاڵۆزی هەیە و پێک

دێت لە زیاتر لە (٢٠٠) توخمی کیمیاوی لەوانە بڕێکی زۆر لە ترشە چەوریە گرنگەکان، هەرچەندە سوودی پزیشکی بەزۆری لە ڕۆنەکەی وەردەگیرێ، بەڵام تۆوەکەشی تۆزێ تام و بۆنی خۆشی هەیە و دەکرێتە ناو چێشت و هەویرەمەنی و پەنیرەکانی دەریای سپی ناوەڕاستەوە.

ڕەشکە یارمەتی هەرس بوون دەدات و بۆ غازاتی ناو گەدە و ریخۆڵە باشە، ڕۆنی ڕەشکە دژە میکرۆبەو کرمی ریخۆڵە لادەبا زۆر لە پسپۆران و کەسانی شارەزا، ڕەشکە بە دەرمانی هەموو دەردان دا دەنێن هیچ کاریگەریەکی لاوەکی نییە ئەگەر بە شێوەی ژەمە دەرمانی ئاسایی بخورێ، بۆ ڕەبو (Asthma) و هەستیاری (Allergies) زۆر باشە ئەگەر بێتو بۆ ماوەی شەش مانگ یان زیاتر بەکاربهێنرێت-لەحاڵەتی هیلاک بوونی زۆردا، هەندێک لە هاڕاوەی ڕەشکە بکەرە ناو جێلی شاهانەوە (Jelly Royal) و بیخۆ.

تاقیگەی بایولۆجی بەرگریکردن لە شێرپەنجە لە دوورگەی هیلتن هێد لە کارۆلینیای خواروو، یەکەمین لێکۆڵینەوەی گرنگی ئەنجام دا لەسەر ڕەشکە بۆ چارەسەرکردن و نەهێشتنی نەخۆشی شێرپەنجە و دەرکەوت ئەنجامەکەی سەرکەوتو بوو، لە نێوان ئەو لێکولینەوانەی کە لەسەر گیانەوەر ئەنجام دران، لێکۆڵینەوەیەک دەری خست ئەو کۆمەڵە مشکانەی کە بە ئەنقەست تووشی شێرپەنجە دەکران، هەموویان دەمردن کەچی دوو لەسەر سێی



ئەوانەی ڕۆنی ڕەشکەیان پێ دەدرا نەدەمردن.

لەنێوان ئەو تاقیکردنەوە زانستیانەی کە لە ئەردەن و ئەمریکادا ئەنجام دران، دەرکەوت ڕۆنی ڕەشکە لە شێوەی هەڵمدا دژی لۆکیمیا (Anti-Leukemia) واتە دژی سپیبوونەوەی خوێنە.

ئەو لێکۆڵینەوانەی کە لە ئەسپانیا و بەریتانیادا ئەنجام دراون ئەوەیان پێشان دا کە ڕۆنی ڕەشکە بۆ چارەسەرکردنی ڕۆماتیزم و هەوکردن باشە.

ڕەشکە دەتوانرێ وەکو چا لێبنرێ، بڕی یەک کەوچکی چێشت دەکرێتە ناو قۆریەوە و یەک کووپ ئاوی گەرمی



تێدەکرێ ئینجا بۆ ماوەی (١٠) دەقیقە دا دەنرێ و دوای ئەوە کوپێک چای باشی لێ دەردەچێ، بەڵام تا ئەو کاتەی کە دەخورێتەوە نابێ سەرەکەی بەتاڵ بێت بۆ ئەوەی تام و بۆنەکەی دەرنەچێ.



هەندێ کەس بڕێکی کەم لە ڕەشکە دەکاتە ناو چا یان قاوەوە، هەروەها دەکرێتە ناو نانەوە، هەندێ کەسی تر هاڕاوەی ڕەشکە تێکەڵ بە هەنگوین دەکەن یان دەیکەن بەسەر زەڵاتەدا.

ئەگەر ڕەشکە و هەنگوین و سیر پێکەوە تێکەڵ بکرێن، باشترین مقەوی (Excellent Tonics) لێ دەردەچێت و بۆ ئەو کەسانەی کە تووشی ڕەبوو کۆکەبوون زۆر باشە، هەروەها بۆ ئەو کەسانە کە دەیانەوێ بەرگری خۆیان بەهێز بکەن دژی هەڵامەت و ئینفلۆوەنزە.

هەندێ کەس ڕۆنی ڕەشکە بە شێوەی کەپسوول دەخۆن بۆ بەکارهێنانی ڕەشکە ماوەی چەند مانگێک قژو نینۆک بەهێز دەکات، هەندێ کەس بۆ جوانی ڕۆنی ڕەشکە لە پێستیان دەدەن و چارەسەرکردنی نەخۆشی پێست وەکو (داء الصدف -Proriasis) و (اکزیما-Eczema).

کەسێک دەتوانێ کرێمێکی ئاسایی بکرێ و هەندێ ڕۆنی ڕەشکەی تێ بکا یان دەتوانێ کرێمێک بۆ خۆی دروست بکا بە گەرم کردنی دوو بەشی یەکسان لە ڕەشکە و جۆرێک لە زەیتی گونجاو هەتاکو ڕەنگی بۆر دەبێ.

کاتێک کە هەستت کرد بەتەواوی گەرم بووە هەندێ مێوی هەنگوین بتوێنەرەوەو تێی بکە و بە کەوچکێک تێکی بدە، ئەگەر ئارەزووت لێ بێ دەتوانی پێش ئەوەی مێوەکە بمەیێ چەند جۆرێکی تر لەو زەیتە گونجاوانەی تێکەڵ بکەیت، هەندێ کەس ئەو تێکەڵە بۆ سووتان و نەخۆشی پێست و نەهێشتنی وشک بوونەوەی پێست و ئێش و ئازار و چرچ و لۆچی دەموچاو بەکار دەهێنێ.

زۆر کەس کوپێک ڕەشکە تێکەڵ بە سرکەی سێو دەکەن و بۆ ماوەی دووهەفتە وازی لێ دەهێنن، دوای ئەوە تێکەڵەکە بە هێڵەگێکی ئاسایی دەپاڵێون، دیسان بە قوماشێکی تەنک دەیپاڵێون و تێکەڵی دەکەن بە دوو بەشی یەکسان لە سرکەی ڕەشکەوڕۆنی ڕەشکە، دوای ئەوە بۆ چەند دەقیقەیەکی کەم گەرمی دەکەن کە لە دواییدا دەی کەنە ناو شتێکی سەر قەپاتەوە و دەیخەنە ناو سەلاجەوە بۆ ئەوەی هەچ کاتێک پێویست بکا لە پێست بدرێ بۆ چارەسەرکردنی عازەبە یان پێش ژەم بڕی یەک کەوچکی چێشتی لێدەخورێ بۆ چارەسەرکردنی غازاتی گەدەو گرفتی هەرس بوون.

## نوو چاپ










**ئەنتۆلۆژیای شیعری سویدی**

وەرگێر:رزگار شێخانی

پەخشخانە/دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس

بەشی یەکەمی کتێبێکە دەقی ئەم شاعیرانەی تێدایە (ئێدیت سۆدێگران،گوننار ئێکێلۆف،ئارتور لوند کڤیست)

**شەهید بەتەنیا پیاسە دەکات**

نووسەر:قوبادی جەلی زادە

پەخشخانە:بەڕێوەبەرێتی گشتی چاپ و بلاوکردنەوە - سلێمانی

کۆمەڵە شیعرێکە لە ٨٥٨ لاپەڕە قەوارە گەورە دایە، بەرهەمی شاعیری داهێنەر قوبادی جەلی زادەیە

**شرۆڤەیەک لە بازنەدا**

نووسەر:سەردار جاف

کۆمەڵە وتارێکی رەخنەییە، نووسەر لەو چەند ساڵەی دواییەدا لە گۆڤارو رۆژنامەکان بلاوی کردوون.

**دیوانا فەقێی تەیران**

ئامادەکار: سەعید دێرەشی

پەخشخانە: دەزگەها سپیرێز یا چاپ و وەشانێ

رەنجێکی شایستە بۆ کۆکردنەوەی هۆنراوەکانی فەقێی تەیران، لە ئەنجامی بەراورد کردنی کۆمەڵێک دەستنووس.

**جواهر المعاني في شرح ديوان أحمد الخاني**

نووسەر: تحسين ابراهيم الدوسكي

پەخشخانە دەزگەها سپیرێز یا چاپ و وەشانێ

هەولێکە بۆ ناساندنی ئەحمەدی خانێ بەزمانی عەرەبی و لێکدانەوەی هۆنراوەکانی بەدوو قۆناغ(معاني المفردات)ئینجا (المعنى العام)

**گەشتێک بەناو مێژوو، بەڵگەنامە، شوێنەوار**

هەڤپەیڤینێکی فراوان لەگەل عەبدولڕەقیب یووسف

سازدانی:ئازاد عەبدولواحید

گەشتێکی دوور و درێژە بەناو گەنجینە و بۆچوونەکانی شوێنەوارو مێژوونووس عەبدولڕەقیب یووسفە.









## مرۆڤ لە نێوان ڕواڵەت و جەوهەردا

جیاوازی نێوان هەردوو وەرگێڕانەکە (عەرەبی و کوردی)بۆ کتێبێکی بەناوبانگی ئێریک فرۆم، لەوەدایە، یەکەمیان: وەرگێڕێکی بە توانا وەریگێڕاوە و پسپۆڕێک پێداچۆتەوە. ئی دووەمیش: واتا ئەوەی بە زمانی خۆمانە، هەر تەنیا (سابیر بەکر بۆتانی - بەرگ) و (سابیر بەکر بۆکانی - ناوەوە) ئەنجامی داوە.

زێدەڕۆیی ناکەین گەر بڵێین ئەم کتێبە قەسابخانەیەکە بۆ خۆی ،بەلام با بڵێین وەرگێرانەکە ورد نیە، ئەگەر چی دوو جارانیش چاپکراوەتەوە.

**فەرموون:**

* بەسەرپەرشتی رۆمان نووسراون(١٩) = کتبا تحت رعایە نادی روما(٢٧)

رۆمان لە کێ و یانەی رۆما لەکێ؟!!!!

* شاعیری ئینگلیزی تینسۆن لە سەدەی هەژدەهەمدا(٢٨)= للشاعر الانجلیزی تینسون فی القرن التاسع عشر(٣٦)

* ئەگەر روانیت،روانینی ورد
نازۆنای گەشەکردوو دەبینی
لە شورای رووەکەکاندا(٢٨) =
واذ انظر وامعن النظر
اري النازونا مزدهرة
فی سیاج النباتات (٣٦)

راناو لە عەرەبیەکە کەسی یەکەمی تاکە لە کوردییەکەدا بۆتە کەسی دووەمی تاک

* دیدار (٢٩) = اللقیە (٣٧) ،دیدار بەعەرەبی (لقاء)ە (لقیە)ش شتێکە بدۆزرێتەوە

* تێبینییەکانی.... پێشکەش دەکەم (٣٢) = ملاحظات أقدم (٤٠)

أقدم راستەکەی: چەند تێبینیەکی کۆنتر

* دلرەق (٨٤ )= قەهری (٩٤) راستەکەی ناچارکردە

دوای ئەستی (٨٧) = بعد اللاشعور (٩٨) بعد = رەهەندە، پەل

* لەسەر شێوەی پاشا ناسراوەکانی رۆژهەلات (١١٨) علی نسق ملک الملوک المعروفە فی ملوک الشرق (١٢٨)

دیارە (ملک الملوک) شاهنشاهە.

* چونکە ئەبلەر....دوو کتێب لە بەرهەمەکانیدا... کە بریتین لە (کۆمەلگای تەواو)و (شۆرشی هیوا). (١٦٩)= و من بین مؤلفاتی کتابان هما (المجتمع السلیم) و (ثورة الامل) (١٧٧) وەک لێرە و لەوێ دیارە لە ناسینی (راناو) وەرگێر زۆر شارەزا نییە.

**- نموونەیەکی هەڵەی چاپ**

(٥١) converging = (٤٣) gny conver*

**- نموونەیەکی خاڵبەندی:**

* لە کتێبی (ئاکاردا) (٨٦) = و فی کتابە (الاخلاق) (٩٨)

راستەکەی لە کتێبی (ئاکار)دا

**- نموونەیەکی زێدەکردنی وشە**

*بەردی بناغە = احجار البناء

**- نموونەیەکی لێکەمکردنی وشە**

وەک نووسەرێکی داهێنەر یا زانایەک یان باخەوانێک (٨٤)

مثل نجار یشتغل بیدیە أو کاتب خلاق أوعالم أو بستاني (٩٤) دارتاشەکەی فرێ داوە

**- نموونەیەکی تاک و کۆ**

* پێغەمبەری جولەکەکانیش داوا لە خەلک دەکات (٥٣)و دعا انبیاء الیهود الناس (٦١)

* ئەوەی زیاتر باوە (بوونایەتی)بۆ (وجود و وجودیة) بە کار دێ و بۆ (کینونة)ش (بوونەوە) گونجاوترە.

* هەر لە درێژەی هەڵەکانیدا لە جیاتی شخصیة تسویقیة، (کەسێتی بازاڕی) بەکار دێنی، ئەمەش لە مەبەست و هزری ئێریک فرۆمەوە دوورە، چونکە بازاڕی مانای (هیچ و پرۆپووچ و هەرزە) دەدات، لە کاتێکا تسویقیە دەرژێتە ئێو بە (کاڵا بوونی مرۆڤ)ەوە

هەڵەکان لە ژمارە نایەن، بەلام ئێمە لێرە بە چەند نموونەیەک باسمان کردووە



# ئاو

## دۆستێکی نزیکی مرۆڤە

ئاو وەک سەرچاوەیەکی گرینگی ژیان و یەکێک لە پێویستییە سەرەکییەکانی مرۆڤە کە هیچ کات بەبێ ئەم سەرچاوەیە مرۆڤ هەڵناکات، ئاو یەکێک لەو هۆکارانەیە کەوا بۆتە هۆی پێشکەوتنی شارستانیەتی ئەوروپاو هەموو دنیا بەهۆی ئەو هەڵکەوتنە جوگرافییەی کە بەگشتی وڵاتانی ئەوروپی بەئاو دەورە دراوە، ئەمەش وایکردووە بەگشتی خەڵکی ئەم وڵاتانە خەڵکێکی هێمن و لەسەرخۆبن و وەکو ئاو ئەرمونیان بن.



هەڵبەتە وڵاتانی ڕۆژهەڵات بەگشتی کە بە چیاو دۆڵ و دەشت و بیابان دەورە دراون کە ئەم سروشتە لەدێرزەمانەوە ڕەنگدانەوەی بەسەر سروشتی مرۆڤەکاندا هەبووە، بۆیە بەگشتی تووڕەبوون و توندی بەدی دەکرێ، دیارە مەلەکردن و تێکەڵ بوونی مرۆڤ بە ئاو، ڕۆژ بەڕۆژ مرۆڤ لەدۆخێکی توندڕەویەوە بەرەو هێوربوونەوە بردووە و هەبوونی زەریاو دەریا گەورەکانی و هەڵکەوتنی وڵاتانی ئەورووپی کە بەگشتی کەنارەکانیان ئاوە، وایکردوە مرۆڤی ئەوێ زیاتر چێژ و خۆشی لەم توخمە ببینن و ئاو بە شتێکی زیندوو لە ژیانیان وەرگرن لەگەڵ ئەوەش هاتوچۆی دەریا کاریگەرییەکی گرینگی بەسەر ئەو شارستانییەتە گەورەیەی ئەواندا هەبووە کە بازرگانی هۆکارێکی گەورەو بەهێزبوو لە دوای سەدەی ڕێنسانس

که بووه ئالوگۆڕکردنی کلتورەکانی هەموو دنیـــا ، هەر بۆیە مـــەلەکــردن و یاریە جۆراوجۆرەکانی ناو ئاو بەردەوام گرینگی پێدراوە.

هەڵبەتە شارێکی وەک شاری هەولێر کە یەک سەرچاوەی ئاوی سروشتی هەیە واتە زێی کەلەکی لێوە نزیکە، تا ئێستا نەتواندراوە سوود لەو سەرچاوە گرنگە وەربگیرێ، هیچ نەبێ چەند شوێنێکی گەشتوگوزاری لەسەر دروست بکرێ تا خەڵکی بتوانن چێژ لەو ئاوە وەربگرن یاخود بهێندرێتەوە ناو هەولێر،ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی شاری هەولێر رووبەکی دیکە وەربگرێت. پایتەختی کوردستان تەنیا(٤)مەلەوانگەی گەورەو بچووک هەیە، کەوا خەڵکی رووی تێبکات،ئەمەش بۆ شارێکی ئەوها پڕ خەڵک زۆر کەمە.

کــاک **ئاراس زێنەدین** بەڕێوەبەری مەلەوانگەی ناو یاریگەی هەولێر دەڵێ: ئێمە وەک مەلەوانگە، لەبەر ئەوە گوشارێکی زۆری خەڵکمان لەسەرە، بۆیە هاتنە ژوورەوەی بۆ ناو مەلەوانگەکەمان بەپێی چین چین دەبێ، هەر چینە خەڵکێک نزیکەی (٥٠)کەس دێنە ژوورەوە وهەر چینێک (١)کاتژمێر لەژوورەوە دەبن و رۆژانە نزیکەی (٨)چین لە بەیانیانەوە تاکو ئێوارە دێن، شەوانەش خەڵکی دێنە ئێرە بۆ مەلەکردن.

سەبارەت بەپاکوخاوێنییەوە، ئێمە بیرێکی ئیرتیوازی سەربەخۆمان هەیەو رۆژانە بە بەردەوامی ئاوەکە دەگۆڕێ و شوێنی خۆ شوشتنمان هەیەو ئاوەکەمان زۆر خاوێنەو لەرووی تەندروستییەوە زۆر تەواوە سەبارەت بە سەرپەرشتی ناو مەلەوانگەکەش، چەند کەسێکمان کە



هەمـوویان مـەلەوانی زۆر باشن، ئاگـاداری ئەو خـەڵکانەن کـە لەناو ئاوەکـەدان و زۆر جـاریش خـەڵکی وا هەیە کـە مـەلە نازانن ئێمە ڕێگەیان نادەین بچنە شوێنە قووڵەکان و ئەگـەر لە مـەترسـیش دابن، ئەوا مـەلەوانەکـانمان دەریان دەهێنن، بۆیە ئێمـە لەرووی پێـداویسـتی و ئاسـانکاری وتەندروسـتـیـیـەوە هەوڵمـانداوە، هەمـوو شتەکان بەرێکوپێکی بکەین و وا بکەین کە خەڵک گلەییمان لێ نەکات.

کاک **برزۆ سابیر** یەکێک بوو لەوانەی کە لەدەرەوە چاوەڕێ بوو بچـێـتـە ژوورەوە بۆ مـەلەکـردن، وتی من زۆر لەو مـەلەوانگەیە رازیمە بەراسـتی لەرووی پاک و خاوێنییـەوە زۆرباشـە، بەڵام یەک گلەییم لێـیـان هەیە، ئەویش هەندێک جار لێپرسراوێک بەخۆی و چەند حـیـمـایەتیکەوە دێت کـە هەمـوویان ژمارەیان نزیکەی (٥)کـەس دەبێت، ئەوانە دەچنە ژوورەوە و کەسی تر بۆی نییە بچێتە ژوورەوە، کـە ئەمـەش گلەیی بەشی زۆری ئەوانەن کەوا دێنە ئێرە بۆ مەلەکردن.

مـەلەوانگەی هۆڵی داخـراو لە تەنیـشت وەزارەتی رۆشنبیرییە ئێستا بێ ئاوە و لەبەر ئەوەی بیـری سـەربەخـۆی نیـیـە ئەمـەش





کێشەیەکە پێویستی بەچارەسەر کردن هەیە، ئەم مـەلەوانگەیە تاکـە مـەلەوانگەیە کـەوا خێزانیشەو هەندێک لە خێزانەکانی شاری هەولێـر جـارجـارە رێک دەکـەون و روو لەو مـەلەوانگەیە دەکـەن، بەڵام ئێـسـتـا لەبەر نەبوونی ئاو ئەوانیش بێبەشن، جا ئەگەر لە هەولێر مـەلەوانگەیەکی تایبەت بە ئافرەتان هەبێت، ئەوا شتێکی شارستانییە و رەنگە بەشـێـک لەو خـێـزانانە بتـوانن هامـوشـۆی مەلەوانگە بکەن.

سـەوسـەن جـەبار وەک کـچـێکی وەرزشکاری ئەم شـارە دەڵێ: بەگـرینگی دەزانم مـەلەوانگەیەکی تایبـەت بە ئافـرەتان هەبێ تا ئێمەش بتوانین مەلە بکەین و وەک رەگـەزی پیـاو کـە بۆ ئەوان هەمـوو ئاسـانکاریەک دەکرێ، بۆ ئەم مەسـەلانەش دەرفـەت بە ئافـرەتانیش بدرێت، کـە مـافی ئەوەمـان هەبێ مەلەوانگەیەکی سەربەخۆمـان هەبێ من بۆ خـۆم زۆرم حەز لە مـەلەکـردنە، بەڵام مەلەوانگەی تایبەت بە ئافرەتان نییە، بۆیە داوا دەکەم شتێکی لەو بابەتە لەشاری هەولـێـر دروست بـکرێت بۆئەوەی من و چەندین ئافرەتی دیکە ئەو حەزەمـان نەمرێت و بەهیوامان بگەین.



# ژەمی بەیانیان گرنگترین ژەمە

و: لە ئینگلیزییەوە: ئارا ئازاد مستەفا

یەکەم ژەم لە رۆژێکدا، ژەمی بەیانییانە و لەهەمووژەمە خۆراکییەکانی دی گرنگترە، کەچی هێشتا خەلکێکی زۆر هەن کە ئەم ژەمەیان فەرامۆش کردووە و تا نیوەڕۆ خواردن ناخۆن! ژەمی بەیانییان بە تایبەتی خواردنە دانەوێلەییەکان سوودێکی زۆریان هەیە بۆ نزم کردنەوەی کێشی مرۆڤ و رێگا لە قەلەو بوون دەگرێت و لە پارێز (رێجیم) باشترە،

هەموو نەخۆشییەکانی وەک قەبزی و شێرپەنجە و قەڵەوی و جەڵتەی دڵ کە لە نەخۆشییە بڵاوەکانن و گەورەترین کێشەی ئوسترالیایە، ژەمی بەیانییان بۆ خۆ پاراستن لەم نەخۆشیانە گرنگترین ژەمە... سەرەڕای بڵاوبوونەوەی ئەو بیرو باوەڕەی کە لەسەرەتای دەستپێکی هەر رۆژێکدا دەبێت نانی بەیانییان بخورێت لەگەڵ ئەمەشدا هەندێک خەڵک هەن کە ژەمی بەیانی فەرامۆش دەکەن...

لە راستیدا لە ئەمەریکا لە نێوان ساڵانی



۱۹٦٥- ۱۹۹۱ ڕێژەی خـــــــواردنـی ژەمی بەیانیـــــــان نزم بۆتەوە لە ۸٦٪ بۆ ۷٥٪ ئەمەش کێشەیەکی گەورەیە، لە ئوسترالیاش لە ۱۲٪ی ئەوانەی تەمەنیان لە دەوروبەری (۱۳) ساڵی دایە ژەمە خواردنی بەیانییان ناخۆن... شایانی باسە ئەوانەی کە نانی بەیانی ناخـــۆن لەوانەیە ڕۆژێک لە ڕۆژان تەندروستییان بەرەو خراپی بچێت لە ئەنجامی نەخواردن و فەرامۆش کردنی ئەو ژەمە.

**ژەمێک مەخۆ... قەڵەو بە!**

پێش دە ساڵ لێکۆڵینەوەیەکی فرە نەفەری ئەمەریکی دەریخستووە کەوا ئەو کەسانەی خـــواردنی دانەوێڵەیی دەخـــۆن و دانەوێڵەی کوڵاو دەخۆن و لە ژەمی بەیانییان سەموون بە خێرایی دەخۆن، (BMI)یان کەمترە بە بەراورد لەگەڵ ئەو کەسانەی کە ژەمی بەیانی ناخۆن، یان گۆشت و هێلکە دەخۆن بۆ بەیانیـــــان و لێکۆڵینەوەیەکی تر دەریخـــســـتـــووە کـــەوا منداڵانی قـەڵەو ژەمی بەیانیـــــان ناخـۆن و کەمتر دانەوێڵەیان وەرگرتووە بە بەراورد لەگەڵ ئەوانەی کە ئاسایین لە کێشدا دەرکەوتووە، کە نانی بەیانی دەوری هەیە لە کـــار تێکردنی تەندروستی و وزە بە لەش دەبەخشێت.

**ژێدەر**

گۆڤاری: (COMPLEMNARY MEDICINE)
ژمـــارە (٦) ت. دووەم/ ک. یەکـــەمی ســـاڵی ۲۰۰٤، ئوستراليا.



# چۆن کۆنترۆلی وزە بکەین

بورهان ئیبراهیم یەعقووب *

وزە ئەو هێز و توانایەیە کە مرۆڤ لە حاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکی تر دەبات هەمووکاتیش مرۆڤ پێویستی بە وزە هەیە، بۆ ئەوەی بتوانێ کار و چالاکییەکانی خۆی بەڕێوە ببات، ئەمڕۆکە وزەی کارەبا لە کوردستان کێشەیەکە، گرفتێکە، بەڵام هیچ گرفت و کێشەیەکیش بێ چارەسەر نییە و کارەبا بە ماندووبوونێکی زۆرە وەبەرهەم دێ، بگرە لە بەرهەم هێنانی لە وێستگەکان و دوایش گواستنەوە و دابەش کردنی، هەر قۆناغێک دەیان ئامێرو دەیان کارمەند و دەیان گرفت و کێشەی هەیە. ئەو ڕووناکییەی کە دەگاتە ماڵەوە، دەگاتە شوێنی ئیش کردن، دەگاتە شوێنی بەڕێوەبردنی چالاکییەکان. بە ئاسانی نایەتە دەست، ماندووبوونی زۆری دەوێ. ئەگەر بێتو ڕێگا زانستییەکان بگرینەبەر بۆ دابەشکردنی کارەبا زۆر کێشە و گرفتمان لە کۆڵ دەبێتەوە.

لە دنیا، لە هیچ شوێنێک کارەبا بێ پارە نیە تاوەکو ئاویش. بەڵام لە وڵاتی ئێمە کەس گوێ ناداتە چۆنیەتی سەرف کردنی کارەبا و ئاو... تێچوونی دروست کردنی وێستگەیەکی کارەبا، بۆ نموونە وێستگەی بەرهەم هێنانی (٢٠٠) مێگاوات، رەنگە ئێستا خۆی لە قەرەی (٢٠٠) ملیۆن دۆلار بدات... با بۆ ئەوەی هاووڵاتی بزانێ قەدر و قیمەتی کارەبا چەندە، بۆیە پێویستە وەزارەتی کارەبا یا خۆد بڵێین بەڕێوەبەرایەتی دابەشکردنی کارەبا، بۆ هەر شوێنێک پێوەر دابنێ. با لیژنەیەک پێک بهێندرێ، شارەزایان بەشداری تێدا بکەن بۆ ئەوەی بتوانن نرخی یەک یەکەی کارەبا دابنێن، هەوڵبدەن بۆ شوێنە جیاجیاکان (نیشتەجی بوون، شوێنی بازرگانی، کارگەکەکان واتە پیشەسازی. شوێنەکانی بەرهەم هێنانی کشتۆکاڵ و ئاودێری). بۆ هەر یەکە لەمانە نرخی یەکەیەک دیار بکرێت. و ئەگەر بێتو مانگانە پارەی کارەبا بدات ئەوە خۆی دەزانێ چەندی سەرف کردووە و چەند پێویستە سەرف بکات، چونکە چەند دەست بە کارەباوە بگرین باشترە، بەڵکو لە هەموو سەرچاوەکانی وزە وەک ئاو ئەویش پێویستی بە دانانی پێوەر هەیە بۆ ئەوەی وزە بە فیڕۆ نەدەین.

چەمکی کەمکردنەوەی کارەبا واتە بەکارهێنانی کارەبا بە شێوەی زانستیانە و سوود وەرگرتن لەو وزەیە، عاقڵانە بە کاری بێنین و زێدەڕۆیی تێدا نەکەین. یەکەمین شت دانانی نرخی یەکەی کارەبا و دانانی پێوەرەکانە بۆ ئەوەی هاووڵاتی لە کاتژمێرێکی دیارکراو بۆ ماوەی (٢٤) سەعات لەهەر دوو حاڵەتدا دیقەت بداتێ و بزانێ لە رۆژێکدا چەندی سەرف کردووە. تا



دەگاتە کرێی مانگانە ئەوکات بەراوردی خۆی دەکا... هەروەها پێویستە فەرمانگەی کارەبا بە رێگای کەناڵەکانی راگەیاندن رێنمایی بڵاو بکاتەوە بۆ هاندانی هاووڵاتیان تا بتوانن کارەبا کەم سەرف بکەن. کە ئەمە بۆتە مایەی گرنگی پێدانی تەواوی دەوڵەتانی دونیا، چونکە پەیوەندی راستەوخۆی بە مانەی خوارەوە هەیە.

١. پلانرێژی ماوەیەکی دوور و درێژ

٢. بەرز بوونەوەی بار (حمل) کە پێویستە بیر لە بەکاربردن بکەینەوە بۆ دروست کردنی وێستگەی بەرهەمهێنانی دیکە.

لە هەمان کاتدا رێژەی دانیشتوان لەبەرچاو بگیرێ کە .ساڵ بە ساڵ زێدە دەکات بۆ ئەوەی بتوانین بەرنامەیەکی (٢٠) ساڵی دابنێین بۆ بەرهەمهێنانی وزەی کارەبا،

پێویستە ئێمە ئەوە بزانین کە تاکی کوردستان ساڵانە چەند کارەبا سەرف دەکات، هەرچەندە ئێمە ئەو دەزگایەمان نییە تۆماری بکات. نەک هەر کارەبا بەڵکو زۆر پێداویستی دیکە هەیە کە زۆر گرنگە بۆ دارشتنی پلانی دوارۆژ و پێویستیەکانی تاکی کوردستانی... پێویستی بە دانانی وەزارەتی پلان و نەخشەدانان هەیە. یان پێویستیمان بە دەزگای تۆژینەوەکانی وزە هەیە، کە پێش نۆ ساڵ بەر لە ئێستا لە رۆژنامەی خەبات بە عەرەبی ساڵی (١٩٩٨)لە وتارێکدا باسم کردبوو چۆن پێویستە دەزگای تۆژینەوەکانی وزە دابمەزرێنین. کەمکردنەوەی پیسبوونی ژینگە چونکە هەندێ وێستگە هەیە دەبنە سەرچاوەی پیسبوونی ژینگە.

٣. گرنگی دان بە سەرچاوەی نوێی بەرهەمهێنانی کارەبا هۆکارەکانی کەمکردنی کارەبا گەلێکن، لەوانە گرتنەبەری تەکنۆلۆژیای نوێ، نرخ دانان، راگەیاندن، یاسادانان و رێنماییەکان، چاکردنەوە، چوستی سیستەمی کارەبا بتوانێ (بەرهەمهێنان، گواستنەی، دابەشکردن).

پێویستە فەرمانگەی کارەبا چەند تیمێک ئامادە بکات، تیمی راوێژکاری کە بە هەر سێ جۆری سەرپەرشتی و هێلکاری کارو کردەوەکان بکات کە چۆن بەرێوە دەچن، کارەبا بە فیرۆ نەروات بۆ ئەوەی لە هەمان کاتیشدا بتوانین کۆنترۆلی زیدەروییەکان بکەن بۆ نموونە وەرگری کارەبا (لە هێزەکانی ئاو) کە هەندێ کەس بە ئاشکرا هێلیان راکێشاوە، بەمە جیاوازییەکی یەکجار گەورە لە نێوان هاووڵاتیاندا دروست دەکات، بۆیە زۆر پێویستە چەند دروشمێک بنووسین و پەیرەوی بکەین.



بۆ نموونە:

١. کەمکردنەوەی کارەبا لەناو ماڵدا و لە چەند شوێنێک دەبێتەوە هۆی کەمکردنەوەی کریاری کارەبا.

٢. ئابووری کردن لە کارەبا بەڵگەی هوشیارییە.

٣. کوژاندنەوەی تەنیا یەک گلۆپ لەهەر ماڵێکدا، کارەبا بۆ شارێک دابین دەکات.

٤. کەمکردنەوەی کارەبا دەبێتە هۆی دانی کارەبا بە ئەوانی دیکە و خۆت.

٥. کەمکردنەوەی کارەبا دیاردەیەکی شارستانییە.

٦. زیدەرۆی لە تۆرەکانی کارەبا، خەڵکانی دیکە لە کارەبا بێبەش دەکات.

ئەمانە و چەندین رێنمایی دیکە، دەبێ بەردەوام لەسەر لاپەرە و شاشە و مایکرەفۆنی کەناڵەکانی راگەیاندن بلاو بکرێنەوە.

*** ئەندازیاری کارەبا**

# Kitêbxaneya Kurdî



## کلیک

محەمەد وەسمان

## سایتی کتێبخانەیا کوردی

**www.kurdishlibray.org**

ئەم سایتەی کە بەم چوار زمانانەیە: کوردی، ئینگلیزی، سویدی، تورکی.

سەبارەت بەو کتێبخانە دەوڵەمەندەیە کە لەساڵی ١٩٩٧ لە ستۆکهۆڵم لە سوید کرایەوە، ژمارەیەکی زۆری کتێب و گۆڤارو بەلاڤۆکی کوردی تێدا پارێزراوە، لەڕێی ئەم سایتەوە دەتوانیت شارەزای ئەم کتێبخانەیە بیت. سەرباری لیستی کتێبەکان، بەڵگەنامە، گۆڤار و ڕۆژنامە، هونەرو وێنەی کوردی، ناڤێن کوردی، کۆمەڵەی دۆستانی کتێبخانەی کوردی، داخویانی و... چەندان تایبەتمەندی دیکەش.

Kitêbxaneya Kurdî

Navên kurdî

Navên keçan
Girls' names
Flicknamn
Kız adları

A B C Ç
D E Ê F
G H I Î
J K L M
N O P Q
R S Ş T
U Û V W

Kitêbxane
Danasîn
Di çapemenîyê de...
Komeleya dostan
Çalakî 2005
Çalakî 2004
Çalakî 2003
Çalakî 2002
Çalakî 2001

Kataloga kitêbxaneyê

Lêgerin di kataloga Kitêbxaneya Kurdî de...

Nivîskarên kurd

Nivîsa Wezîrê Eşo: Çend dîtin li ser edebîyeta kurdî li Ermenîstanê - Axaftin di semînara

# چاویلکەدار و کۆمەڵگا چۆن لێک دەڕوانن

ئا: نیاز عەبدوڵڵا

**کچێک:**

**هەندێک کچ کە چاویلکە لەچاو ناکەن، لەبەر ئەوەیە خێزانەکەیان یان باوک و براکانیان ناهێڵن لە چاوی بکەن.**

**کوڕێک:**

**زۆرجار توانجیان تێ گرتووم و پێیان وتووم چوارچاو...!**

چاوەکان بە دەروازەی بینینی شتەکانی دەوروبەر دادەنرێن و کاریگەریان لەسەر جوانی و جوانبوونی رووخسار هەیە. چاویلکە لەچاو کردنیش کاریگەری لەسەر جوانترکردنی رووخسار هەیە، هەندێک جاریش بە پێچەوانەیە، جگە لەوە چاویلکە وەک چارەسەرکردنێک بۆ چاوەکان و پاراستنی چاوەکان بەکار دەهێندرێت، بەڵام **مەریوان عەریف** دەڵێت: (لەناو کۆمەڵگای ئێمەدا هەندێ کەس سەرەڕای ئەوەی کە چاویان کەمبینە، چاویلکە لەچاو ناکەن، چونکە لەلایەن هەندێک کەسانی ناو کۆمەڵگا بە دیدێکی نائاسایی و کەمئەندام تەماشادەکرێن، ئەمەش وا دەکات چاویلکە لەچاو نەکرێت یاخود لەچاوکردنی کەم ببێتەوە).

لێرەوە بیروڕای جیاواز لەناو کۆمەڵگادا دروست دەبێت و مەبەستەکانی بەکارهێنانی

بکات بە تایبەت کە چاویلکەکەش لە جۆری فۆتۆ بووە و دەڵێت: (جارێکیان دەگەڕامەماڵەوە، دراوسێیەکەمان یەکسەر پێیان وتم ها چاویلکەکەت گۆڕیوە؟ بۆیە خەڵکانێک هەن چاویلکەیان بەلاوە ئاسایی نییە بۆ نموونە جارێک دوو گەنج وتیان: ئەرێ ئەو چاویلکەیەت نافرۆشی؟ منیش دڵم تەنگ بوو و پێم وتن ئینشائەڵڵا بە نسیبی ئێوەش دەبێت. هەندێک کەس وا دەزانێ گەر چاویلکە لەچاو بکەیت، ئەوا کەسێکی بە تەمەن و پیری، لە کاتێکدا تەمەن هەموو کات ڕێخۆشکەر نییە بۆ چاو کزبوون، قوتابییەکی هاوپۆلم هەیە پێم دەڵێ: چۆنی دوکتۆر، ئەمەش تەنها لەبەر ئەوەیە چاویلکە لەچاو دەکەم. لە هەمان کاتدا گەر کەسێک پێویستی بەوە بێت چاویلکە لەچاو بکات و بەردەوام نەبێت لە چاویلکە لەچاو کردن، ئەوە دەبێتە هۆی ئەوەی تەندروستی چاوەکانی خراپتربێت، بۆیە باشترین شت ئەوەیە گوێ لە توانجی خەڵکی نەگیرێت.



**مەریوان عەریف**، لاوێکە چاویلکە بۆ جوانی لە چاو دەکات، چونکە بەلایەوە جوانە و وا هەست دەکات چاویلکە بەهەر دوو جۆرەکەیەوە کاریگەرییەکی زۆری لەسەر جوانتر بوونی ڕووخسار هەیە، جگە لەوەی تا ڕادەیەک بە پێویستی دەزانێ بۆ پاراستنی تەندروستی چاوەکانی بە تایبەت لە کاتێکدا کە پێویستە بۆ جێبەجێ کردنی هەندێ کاری ورد، لەهەمانکاتدا زۆر کەس لە گەنجەکان کە چاویلکە لە چاودەکەن بە تایبەتی جۆری چاویلکەی ڕەش بۆ ئەوەیە بە ئارەزووی خۆیان تەماشای کەسی بەرامبەری پێبکەن بە تایبەتی ئەگەر کەسی بەرامبەر کچ بێت. ئەمەش لەناو کۆمەڵگای ئێمەدا شتێکی زۆر باوە بە تایبەتی لەناو کۆلێژ و



چاویلکەش لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێت.

**مهاباد حەسەن**، ماوەی ساڵێک دەبێت چاویلکەی پزیشکی لەچاو دەکات بە هۆی ئەوەی چاوەکانی تووشی کزبوون بووە، بۆیە بەلایەوە ئاساییە چاویلکە لەچاو بکات، بەڵام زۆر جاران لەبەر قسە و توانجی خەڵکی لەچاوی نەکردووە لەسەرەتادا شەرمی دەکرد لەچاوی

پەیمانگاکان و هەندێ شوێنی تری وەکو ناو بازاڕەکان.

بەڵام من لەوانەم کە چاویلکە بۆ جوانی لەچاو دەکەم، کەچی لە هەندێک جێگای وەکو دێکان و شارۆچکەکان چاویلکەی رەش لەچاو ناکەم، چونکە بە شێوەیەک تەماشات دەکەن کە گەنجێکی کەم حورمەت و لاساریت، ئەمەش وا دەکات کەم گوێت لێ بگیرێت و قسەکانت بەهەند هەڵنەگیرێت، بۆیە لەو حاڵەتانەدا ناچاردەبم کە چاویلکە لەچاو نەکەم لەبەر ئەوەی ئەگەر کەسێک لەبەر هەر هۆکارێک بە چاوێکی سووک تەماشات بکات، ئەوا ئامادەی هەر چ شتێک بکەی تاوەکو ئەو تێڕوانینەی ئەو بگۆڕێت، ئەو کەسانەی کە تێڕوانینێکی نائاساییان هەیە بەرامبەر بەهەر گۆڕانکاریەک لە بیرکردنەوە و جەستەدا، هەمیشە هەر ئەوانن بەرەخنە و توانجی بریندارکەر ئاراستەی کەسی بەرامبەر دەکەن.

**سوعاد کەریم**، ئافرەتێکی گەنجە، بەڵام تاوەکو ئێستا چاویلکەی بە هیچ جۆرێک لەچاونەکردووە، چونکە لە شوێنێک بووە کە چاویلکەیان بەلاوە ئاسایی نەبووە بە تایبەت جۆری چاویلکەی رەش و دەڵێت: پێم عەیبە چاویلکە لە چاوکەم لەبەر ئەوەی کە کچێک چاویلکە لەچاو دەکات، کوڕە گەنجەکان توانجی تێدەگرن و گاڵتەی پێ دەکەن. من ئەمەم بە چاوەکانی خۆم بینیوە، بۆیە دەڵێم گەر منیش چاویلکە لەچاو بکەم بەو شێوەیە گاڵتەم پێ دەکەن، جگە لەوە هەندێک کچ کە چاویلکە لەچاو ناکەن لەبەر ئەوەیە خێزانەکانیان یان باوک و براکانیان ناهێڵن لەچاوی بکەن، چونکە وا تێدەگەن گەر کەسێک چاویلکە لەچاو بکات، ئەوا کەم رەوشتە. بۆیە گەر چاوەکانم تەندروستیشیان تێکبچێ، ئەوا ئامادەنیم لە چاوی بکەم، چونکە چاویلکە وات لێدەکات وەکو ئافرەتێکی بە تەمەن دیاربیت، منیش رقم لە پیربوونە و تەنها لە کاتێکدا ئامادەم لە چاوی بیکەم، کە زۆر پێویستیان پێی بێت ئەوەش بە مەرجێک لە ماڵەکەمدا بیکەم و کەسی تر لە دەرەوە نەمبینێت، تاوەکو ئێستا چەندین چاویلکەی جۆراوجۆرم بە دیاری بۆ هاتووە، بەڵام هیچیانم بۆ تاقی کردنەوەش لەچاو نەکردووە.



**مستەفا مەولوود خدر**، پێی وایە تێڕوانینی کۆمەڵگا بەرامبەر بە چاویلکە لە کۆمەڵگایەکەوە بۆ کۆمەڵگایەکی تر دەگۆڕێت و جیاوازە و دەڵێت: لە کۆمەڵگای ئێمەدا تێڕوانین بۆ چاویلکە لەچاوکردن تا ئاستێکی کەم باشە، ئەوانەی چاویلکە لەچاو دەکەن بە تایبەت گەنجەکان وا هەست دەکەن گەر چاویلکە بەهەر دوو جۆرەکەیەوە لەچاو بکەن، ئەوا لە رووی جەستەیی، رووخسار و تەندروستییەوە کەم و کوڕییان هەیە و پیر دەبن. خۆم کە چاویلکەی پزیشکی فۆتۆ لە چاو دەکەم، هەست دەکەم بەرامبەرەکەم بە شێوەیەک لێم دەڕوانێ کە بەتەمەنم و کەم و کوڕیم هەیە، لە کاتێکدا ئەمە وا نییە، بۆیە دڵم تەنگ دەبێت کە دەزانم ئەوان وا بیر دەکەنەوە. جگە لەوەش زۆرجار توانجیان تێگرتووم و پێیان وتووم (چوارچاو) کە زۆر برینداری کردووم، لە کاتێکدا کارەکەم وا دەخوازێ کە چاویلکە لەچاو بکەم، چونکە کارکردن لەسەر ئامێری کۆمپیوتەر چاو لاواز دەکات، بۆیە ئەگەر چاویلکە پێویست نەبوایە بۆ چاوەکانم، ئەوا لە چاوم نەدەکرد و ناکرێ نکۆڵی لەوەدا بکرێت کە چاویلکە پارێزگاری لە چاوەکان دەکات.

**خەدیجە عەلی**، حاڵی حازر چاویلکە لەچاو ناکات، چونکە پزیشک بۆی دانەناوە، بەڵام دەڵێت چاوەکانم خەریکە کز دەبن و هەرکاتێک پێویست بەو بکات، ئەوا لە چاوی دەکەم، چونکە پاراستنی تەندروستی چاوەکان زۆر گرنگە. زۆرجار پێم سەیرە کە گەنجێک دەبینم پێی عەیبە ئەو چاویلکەیە لە چاوکات کە پزیشک بۆی داناوە، چونکە لەچاو نەکردنی بەشێکە لە خۆبایی بوونی ئەو کەسەی واهەست دەکات



ناشرین دەبێت و گەر کەسێک بێت بۆ خوازبێنی ئەگەر کچ بێت، یاخود ئەگەر کوڕبێت بچێت بۆ خوازبێنی کچێک ئەوا پێی رازی نابن و پێی دەڵێن کت وکوێرە، راستە خەڵک هەیە بەو شێوەیە بیردەکاتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نابێت مرۆڤ گوێ بەو شتانە بدات.

**رەنجدەر مادادوی**، ماوەی (٩) ساڵ دەبێت بەکاری فرۆشتنی چاویلکەوە خەریکە و ساڵ دوای ساڵ مۆدیلی جۆراوجۆرو جیاوازی چاویلکە دەهێنێت و لە بازاڕدا دەیفرۆشێت دەڵێت: گەنجێکی زۆر، رۆژانە چاویلکە دەکڕن، تەنانەت گەر مۆدیلێکی نوێی چاویلکە بێت، ئەوا دەیکڕن و خۆیانی پێ جوانتر دەکەن، ئێستا رێژەی چاویلکە لەچاو ساڵانی رابردوو زۆر زیادی کردووە، چونکە ئەگەر پێشتر چاویلکە هەر لەبەر پاراستنی تەندروستی چاوەکان لەچاو کرابێت، ئەوا ئێستا خەڵکی بۆ جوانیش لە چاوی دەکەن بە تایبەت ئەو چاویلکانەی

هاوێنەکەیان ژمارە سفرە، ئەوانەی کە دێن چاویلکە دەکڕن زۆربەیان گەنجن و کەمجار ڕێک دەکەوێ کەسێکی بە تەمەن چاویلکەی جۆری ڕەش بکڕێت.

بۆ زیاتر زانیاری وەرگرتن دەربارەی پێویستی چاویلکە لەچاوکردن و سوودەکانی، (**سەفین جاسم محەمەد**) پسپۆڕ لە دەستنیشانکردن و پشکنینی چاومان دواندو لێمان پرسی:

*** چاویلکە چ کاتێک پێویستە لەچاو بکرێت؟**

- چاویلکە دوو جۆری هەیە کە پزیشکی و هەتاوییە هەردووکیان پێویستن و بەر چاوی خەڵک ڕووناک دەکەنەوە، پێویستی چاویلکە لەچاو کردن بە پێی کەس و تەمەن دەگۆڕێت، بۆ نموونە ئەوانەی لە تەمەنی (٤٠) ساڵ بەسەرەوەن، پێویستیان بە چاویلکەی نزیک بینە، بەڵام چاویلکەی هەتاوی کە لە کۆمەڵگەی ئێمەدا تەنها لایەنەجوانییەکەی لێک دەدرێتەوە، ئەگەر بەلایەنە پزیشکییەکەی لێکی بدەیتەوە ئەوا بۆ حاڵەتەکانی وەکو هەستیاری چاو لە تیشکی ڕۆژ بەکار دەهێندرێت و چاوی پێ پارێزراو دەبێت. بۆیە هەرکەسێک چاوەکانی کز بێت، پێویستی بەوە هەیە کە چاویلکە لەچاو بکات بە تایبەت ئەوانەی تەمەنیان بچووکە، چونکە چاویلکە لەچاو کردنەکە بۆیان دەبێتە چارەسەر، کەچی ئەوانەی تەمەنیان گەورەیە چاویلکە لەچاو کردن دەبێتە هۆی پاراستن و بەرگریکردن بۆ چاوەکان و ناهێڵێت چاویان لەوە کزتر بێت.

ئێستا داواکاری لەسەر چاویلکە زۆرترە بە هۆی ئەوەی کە گەنج سەتەلایت دەبینێت و پەیوەندی بە جیهانی دەرەوە هەیە و ڕۆژانە مۆدیلەکان دەگۆڕێن بۆ نموونە داواکار هەیە چاویلکەی بێ چوارچێوەی دەوێت واتا ئەو جۆرەی کە لە سەتەلایتدا دەیبینێت، کچی وا هەیە ڕەنگی چاویلکەکەی لەگەڵ جۆری جلوبەرگەکەی دەگۆڕێت و ئەم حاڵەتە لە کوڕانیشدا هەیە. لە هەمانکاتدا خەڵکانێک هەن ڕۆشنبیرییان کەمە و دەڵێن چاویلکە حاڵەتێکی ناشرینە و هەشە شەرم دەکات چاویلکە لەچاو بکات، ئەم حاڵەتەش زیاتر لەناو ئافرەتاندا زۆرە، هەندێ جار کەسەکە هەقی خۆیەتی شەرم بکات، چونکە دەڵێن کچی فلان کەس چاوی کزبووە ئەمەش وادەکات شەرم بکات و چاویلکە لەچاو نەکات و دواتر ڕۆژ بەڕۆژ چاوی کزتر بێت، ئەمەش زیاتر لە لایەن ئەم کەسانەوە دەبێت کە زۆر خێلەکین، تەنانەت هەندێکیان کە دێن لەبەر ڕاددەی چاوکزییەکەیان پزیشک ناچاری کردووە کە دەبێ چاویلکە لەچاو بکات، بۆیە زۆر بەشەرمەوە چاویلکەکە هەڵدەگرێت، یاخود هەیە دایک و باوکی حەزناکەن کچەکەیان چاویلکە لەچاوکات و دەڵێن کچەکەمان عەیبدار دەبێت، بەڵام چارەسەر هەیە بۆ ئەو کەسانەی کە چاویلکە لەچاوکردنیان پێ شەرمە، دەتوانن هاوێنەی چەسپاو بەکار بهێنن لە بری چاویلکە.



# چارەسەرکردنی لۆچەکانی دەموچاو بە شێلان










پێستی مرۆڤ هەرگیز ناتوانێ جوانی و رەونەقی خۆی بپارێزێ، تەنها بە گرتنە بەری سیستەمێکی رێک و پێکی خۆراک و خۆپاراستن نەبێ لە مادده پیسە جیاجیاکانی وەکو جگەرەکێشان، هەروەها بە خۆ پاراستن لە تیشکی خۆر و ئەنجامدانی وەرزش نەبێ، شێلان بە یەکێک لە شێوازە سروشتیەکان دادەنرێ، کە هەمیشە پێستی مرۆڤ بە جوانی دەهێڵێتەوە و لۆچەکان لا دەبات.

ئەو شێوازەش کە شارەزایانی چارەسەری سروشتی ئامۆژگاری ئەنجامدانی دەکەن بە رێگایەکی زۆر سادە و ساکار جێبەجێ دەکرێت. کە دانانی دوو کەوچکە لەناو ئامێری سارد کەرەوەدا بۆ ماوەی چەند خولەکێک، پاشان ئەو هەنگاوانەی خوارەوە بە هۆی دوو کەوچکە ساردەکەوە ئەنجام دەدرێ.

١. بۆ کەمکردنەوەی لۆچەکانی نزیک گۆشەی هەردوو چاو: دوو کەوچکە کە لە نزیک هەردوو کۆتایی چاوەکان دادەنرێ و پاشان بە هێواشی بجوولێتەوە، هەروەک بازنەی بچووکی پێ دروست بکرێ ئەم جوولانەوەیە سێ جار بە ئاراستەی میلی کاتژمێر و سێ جاریش بە پێچەوانەی ئاراستەی میلی کاتژمێر دووبارە بکرێتەوە.

٢. بۆ چالاککردنی ماسوولکەکانی مل: گەردەنت کەمێک بەرز دەکەیتەوە و دوو کەوچکەکە لەسەر ملت دادەنێی بە تایبەت ئەو شوێنەی دەکەوێتە بن روومەتتەوە، کەمێک دەستت دادەگری و پاشان لەسەرەخۆ دەستت شل دەکەی و بەرەو لای گوێچکە دەیجوولێنیەوە و جوولانەوەکە دووبارە دەکەیتەوە.

٣. بۆ توندکردنەوەی ماسوولکەکانی خوارەوەی سەروچاو: هەر کەوچکێک بە دەستێکەوە بگرە و هەر جارەی یەکێکیان بخە ژێر گەردەنەوە و ناوەڕاستەکەی بەپشتی کەوچکەکەوە بشێلە، پاشان کەوچکەکان بەرەو تەنیشتەکان ببە و بیگەڕێنەوە ناوەڕاست ئەم جوولانەوەیە دووجار ئەنجام بدە.

٤. کەمکردنەوەی لۆچەکانی دەوری دەم: .

هەردوو کەوچکەکە لەسەر هەردوو لای دەم دادەنرێ و لەسەر هەردوو لێودا شێوەی پیتی (٥) دروست بکە، دوو کەوچکەکە بەرەو خوارەوە دەجوولێنیەوە و بازنەی بچووکی پێ دەنەخشێنی کە کەوچکەکانیش دەگەنە هەردوو سووچەکەی دەم، سێ بازنەی بچووکی لێ دروست بکە جاری یەکەم بە ئاراستەی میلی کاتژمێر بێت و جاری دووەم بە پێچەوانەی ئاراستەی میلی کاتژمێر بێت و ئەم جوولانەوەیەش دووجار دووبارە بکەرەوە.



# قسەیەک بۆ ڕۆشنبیر

محەمەد تەها حوسێن

ڕۆشنبیریی سەرمایەیەکی ڕەمزیی هەر کۆمەڵگە و گروپێکی ئادەمییە، فەزایەکی ئینتیمای هەرە فراوانە و کارکردی ئینسانی بونیادنەری سەرەکی کۆی پێدراوە مادی ومەعنەوییەکانیەتی، ڕۆشنبیریش کاراکتەرێکی بیرکەرەوە و بەرهەمهێنی بەردەوامی بەرهەمە فیکری و کولتوریەکانی نێو ئەو فەزایەیە.

ئیشکردن لەسەر کولتور (کولتوری کوردی) لە شێوەی قسەکردن یا نووسین یا بیرکردنەوە و بەرهەمهێنانی فیکر، چ فیکری سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابوری، سایکۆلۆژی، ئەدەبی...هتد بەردەوام و بە حەتمی ڕۆشنبیر لە پەیوەندیدا لەگەڵ کولتورەکەی دەهێڵێتەوە.

خۆ دوورگرتن لە فەزای کولتوری و دان نەنان بەرەگەزە کولتوریی و هەڵسوڕێنەرانی و خۆ بەگەورەتر زانین لە کاراکتەرەکانی دیکەی فەزاکانی (سیاسی، کۆمەڵایەتی...هتد) کولتورو ڕەتکردنەوەی هەر پەیوەندییەک لە نێوان خۆت وەک ڕۆشنبیر لەگەڵ بکەر و بەرهەمهێنەکانی دیکەی تر جۆرێکی دیکەی قودسیەتە و واوەتریش ڕەفتارێکی توندوتیژی هزری و بیرکردنەوەیەکی ئوسولیانەیە.

سیاسیەکانی وڵاتی تۆ بە بیرکردنەوەی ڕاست و هەڵە و بەرەفتاری شیاوو نەشیاویان کاراکتەرە سیاسیەکانی نێو فەزای سیاسی وڵاتی خۆتن سروشتی پەیوەندییەکانی هەرچی فەزاکانی ژیان هەیە دینامیکیانەیەو سیاسی لە ئەدیب و ڕۆشنبیر لە سیاسی و کۆمەڵناس لەمەلا و مەلا لە قەشە و...هتد نابوێرێ.

خۆ دوورگرتنی دەسەڵات لە ڕۆشنبیر کە هەمیشە تۆمەتی سەرزاری ڕۆشنبیرانە و لەراستیشدا وایە، لە بەرامبەریشدا دوورکەوتنەوەی ڕۆشنبیران لە دەسەڵاتە سیاسیەکان، هەڵوێستێکی یا ڕەفتارێکی ناسروشتی و دەرچووە لە حەتمیەتی پەیوەندی فەزاکان و ڕێک ئاراستەگرتنێکە بەرەو ئەوپەڕگیری و ئوسولیەتی فیکری (سیاسی، ڕۆشنبیری).

گوتاری ڕۆشنبیر نابێ بگاتە ئەو ئاستی ئیستیعلایەی هاوڕێبوونی سیاسی بەشەرم و کوفر بزانێ و بڵێ من هەرگیز پێویستم بە هاوڕێیەتی و ناسینی ئەوان نییە.

ڕاستە ڕۆشنبیران بەرهەمهێنی فیکرو فەرهەنگن و زیاتر لە زاکیرەی مرۆڤدا دەمێننەوە و سیاسیەکان هەڵسوڕێنەری جولەو پەیوەندی نێوان فەزاکانی ژیانن و ناوە ناوە دێن و دەڕۆن وەلێ زرنگترینیان ئەوەندەی پێ دەبرێ ببێ بە خاوەنی میتۆدێکی سیاسی، ڕۆشنبیرەکەش قوتابخانەیەکی هزری.

لە دیموکراسیدا بەقەد ئەوەی سیاسی وەک جاران موقەددەس نییە و چیدی لە لوتکەی هەرە سەرەوە، خوارەوە بە بچووک نابینێ، ڕۆشنبیریش بژاردە و پیرۆز نییە و کاڵاکانیان لە کاڵای سیاسی و کرێکار و مامۆستا و کاراکتەرەکانی دیکە لە بازاڕ زیاتر ناهێنێ.



